نەمینداریتی گشتی ڕۆشنبیری و لاوان یارمەتی چاپکردنی داوە





# ڕاپەڕینی نیکاراگوا

## ١٩٥٦ - ١٩٧٩

مەسەلە بنچینەییەکانی شۆڕشی خەڵکی نیکاراگوایە

برهان قانع

١٩٨٤

لە چەند سەرچاوەیەکەوە وەرگیراوە و ئینجا کراوە بە کوردی

ئەمینداریتی گشتی رۆشنبیری و لاوان یارمەتی چاپکردنی داوە

# راپەڕینی نیکاراگوا

## ١٩٥٦ - ١٩٧٩

مەسەلە بنچینەییەکانی شۆڕشی خەڵکی نیکاراگوایە

برهان قانع

١٩٨٤

لە چەند سەرچاوەیەکەوە وەرگیراوە و ئینجا کراوە بە کوردی

**پێشکەشە بەو کەسانەی :**

بە بێ چاوەڕوانی پاداشت ، لەپێناوی گەلدا ڕائەپەڕن ..

**( وەرگێڕ )**

---


- **چاپی یەکەم**
- چاپخانەی ( الحوادث ) ـ بەغدا

## پێشـــەکی :

بۆ ئەوەی کتێبخانەی کوردی لـەو زێڕە ئەدەبی‌یە بێبەش نەبێت‌و خوێنەری کورد لـە راپەڕینە یەك لە دوای یەکەکانی گەلی نیکاراگوا تێ بگات ئەم کتێبەم کرد بە کوردی •• وە پێم وایە کارێکی خراپم نەکردبێ•

سەرنجدانێکی راپەڕینەکەی نیکاراگوا ئەوەمان بۆ ئەســەلمێنێ کـە هـەر هێزێـکی شۆرشگێڕ پێویستی بە هاریکاری کردنی لایەنەکانی تر هەیە لە هەر کارێـکی گۆڕانکاری ریشەیدا •

پاڵەپەستۆی شەڕی ساردی نێوان ئەمەریکاو بەریتانیا لە وڵاتێـــکی زێر دەستە کراویٔ وەکو ئەو کاتەی نیکاراگوا لەسەر تەماعی دزینی کـانە زێڕەکانی «کالیفۆڕنیا» بوو بە هۆی راکێشانی ئەو رێـگا ئیمپریالیستی‌یەی نێوان ئۆقیانووسی گەورەو دەریای « کاریبی » ••

پاش سڕینەوەی دوا شوێن پێی بەریتانیایەکان لەســـەر رواڵەتی ئابوری نیـکاراگوا ئینجـــا ریژیمی «زیلایا» دەرگـــای ئابوری وڵات‌و

تالآنـکردنی سەرمایە سروشتی‌یەکانی ولآتی لـــە رووی سەرمایەدارانی دەرەوەدا بە تەواوی خستە سەر گازی پشت ..

لــە شەڕی ناو خۆیی نیکاراگوا چەندان هێزو دەستەو تاقمی سیاسی‌و چەکـــدار رژانە گۆڕەپانی راپەڕینەوە : هەر لـــە کۆنەپارێزو لیبرال‌و لایەنگرانی شەڕی درێژ خـــایەنی خـــەڵك‌و ئەپۆزیسیونی بۆرجوازی‌و کرێـکارو جوتیـــارو رۆشنبیرە شۆرشگێڕەکـــان تا ئەگـــاتە بەرەی ئازادیخوازی گەلی ساندینیستا بە هەرسێ باڵەکەیەوە لـە دژی سۆمۆزاو پاسەوانە بەناو گەلی‌یەکانی دەستی سۆمۆزا ، راپەڕین‌و چـوون بەگژ ســـەرمایەی دەزگا ئینحیـــاری‌یەکانی دەرەوەو بانقی راووروتکەرانەی دەستە دەلآڵ کارەکان‌و سامانی کاپیتالیستیانەی سوموزا لە نیکارا گوا دا .

کەلەبەر کەوتە راپەڕینەکە بە زۆری هۆی یەك نەگرتنی باڵە کانی ناو دەروونی خەڵـکە شۆرشگێڕەکان بوو ، چونکە ئەو توێژو چینـانەی دژی دەسەلآتی سوموزا راپەڕیبوون قازانجی هەموویان لـــە بوارێـکدا یەکانگیر نەئەبو .

خۆنیشاندانە بەر بلآوەکانی خەڵـکی شارەکانی نیکاراگوا درێژەی بە خەباتی چەکدارانەی خەڵـگی لادێـکان ئەدا .

سەرکەوتنی بەرەی شۆرشگێڕی نیکاراگوا بە هەموو لایەنەکانیەوە، دوای ٤٦ساڵ حوکمی گرێدراو بە ئیمپریالیزمی ئەمەریکاوە گەورە ترین دیاردەی مێژوویی‌یان لە ئەمەریکای لاتین‌دا هێنایە دی‌و ئەو دەرسەی لـــە ڤێتنامدا بە ئیمپریالیزم درا لە نیکاراگواش دوبارە کرایەوە .

نیکاراگوا هەر چەند ولآتێکی ئابوری دواکەوتوو بوو لەچاو ولآتانی تری ئەمەریکای ناوەندو ریفۆرمە لیبرالیەکان لـــە سەرەتای سەدەی

بیستەمدا کاپیتالیستی‌یان تیا هێنایە کایەوە ، بەڵام لە دوای دوەمین شـەڕی جیهانی توانی ژێرخانێکی بنچینەیی ئابوری بۆ خۆی پێك بێنێت‌و بەهـۆی مودێرنیـزە کردنی بانقەکـانەوە سیستەمێـکی سەرمایەداری گرێدراوی گەشەکردو دابمەزرێنێت •

گێژاوی سیستەمی سەرمایەداری جیهانی لە کۆتایی ساڵی **١٩٧٣** دا کارێـکی زۆری کـــردە ســەر نیکاراگوا ، جـــگە لەوەی یەکـگرتنی ناکۆکی‌یەکانی ژێر باڵی ڕیژیم‌و بەهێز بونی تەواوی ئەپۆزیسیۆنی خەڵك بە هەموو توێژو چینەکانیەوە توانی لـە بەرەبەیانی ڕۆژی **١٧**ی مانـگی تەموزی ساڵی **١٩٧٩**دا پاشماوەی ئەندامەکانی ئەنجومەنی پارلمان ناچـار بـکات بڕیار نامەی دەست کێشانەوەی سوموزا لە کاروباری سەرۆکایەتی دەسەڵاتی وڵات مۆر بکەن •

ڕاپەڕینی نیکاراگواو شکاندنەوەی ستراتیجی ڕیفۆرمیستی بەسـەر دەسەڵاتی سیاسی‌دا جارێـکی تر ئەوەیان سەلماند کـــە بـە دەست هێنانی دەسەڵاتی سیاسی‌و پاراستنی تەنیا لە ڕێـگای تێکشکاندنی تەواوی ئۆرگانە زەبروەشێنە کـــانی ســـەر بە ئیمپریالیزم‌و لـەناو بردنی لەشـــکری ئیمپریالیستیانەوە ئەبێت • بۆیە ئەم کتێبە پێشکەش بەو کەسانە ئەکەم کە بە بێ چاوەڕوانی پاداشت لە پێناوی گەلدا ڕائەپەڕن (★) •

**برهـان قانـع**

(★) بۆیە ئەم پێشەکی یەمان بە کورتی نووسی ، لەبەر ئەوەی پێشەکی یەکـێك لە سەرچاوەکانو کتێبەکە زیاتر باسـەکە بـە خوێنـەر ئەناسێنن ــ **وەرگـێڕ** •

## پێشەکی یەکێك لە سەرچاوە وەرگیراوەکان(١)

شەڕی ناو خۆیی نیکاراگوا هەر ڕۆژەی ناوچەیەکی فراوانتر ئەگرێتە بەر ، بەرەی ئازادیخوازی گەلی ساندینیستا تا ئێستا توانیویتی بەشێکی زۆری وڵاتەکە رزگار بکاتو هێزە شۆڕشگێڕەکان نزیك بە پایتەخت بوونەتەوە ، لەناو شاری «ماناگوا» دا شەڕێکی دەستەویەخەیی توند هەیە ، بەشێکی زۆری گەڕەکە هەژارنشینەکانی شار کۆڵانەکانیان سەنگەر بەندی کراوەو ڕێگای هاتو چۆو جموجوڵی هێزەکانی دوژمن گیراوە ٠

ڕێژیمی دیکتاتۆری سوموزا دەستی کردوە بە کوشتاری دەستە جەمعی خەڵکی بێچەکو بە هەزاران کەس لە خەڵکی ئەو شارە لە ماوەی چەند هەفتەیەکدا کوژران(٢) ٠ دوژمن گەڕەکە ئازادکراوەکان بە توندی بۆمباران ئەکات ٠

(١) ئەم پێشەکییە ساڵی ١٩٧٩ نوسراوە بەڵام لەبەر ئەهمیەتی نوسینەکە کرا بە کوردی ٠٠

(٢) چەند هەفتەیەك لەهەمان ساڵی نوسینی پێشەکییەکەدا ٠٠٠ ( وەرگێڕ )

هەواڵنووسەکانی جیهان لە چەند راپۆرتێکدا ئەوەیان ئاشکرا کردوە کە تەنیا لە شاری «ماناگوا» زیاتر لە پازدە هەزار کەس کوژراوون .. لە دەزگا رۆژنامە نووسی‌یەکانی جیهاندا چەندان راپۆرت لە بارەی بومبارانی ناوچە دەستەپاچە نشینەکانو کوشتنی خەڵکی دەستە جەمعی‌و سوتاندنی خانوو بەرەو وێرانکردنی کێڵگەو مەزراو شارەکانو ... بڵاو کراونەتەوە . بە جۆرێك ئەکەوێتە بەرچاو کە ئەم ناوچەیە گەورە ترین شوێنی پێکادانو شەڕو راپەڕینی شۆرشگێڕانە بێت .

بنەماڵەی سوموزا نزیکەی نیو سەدەیە حوکمی وڵاتی نیکاراگوا ئەکەن . ئەم بنەماڵە تاوانبارە بە هۆی گرێدراوی‌یانەوە بە ئیمپریالیزمی ئەمەریکاوەو بە پشتیوانی لەشکری ئیمپریالیستی‌و هەندێك لە بۆرجوازی‌یەکانەوە توانیوێتی بە زەبری کوشتنو برین‌و دەست وەشاندنی دڕندانەوە درێژە بە دەسەڵاتی حوکمڕەوایی خۆی بدات .. ئەوەتا ، ئیستا ئەبینن تەمەنی ئەو بنەماڵەیە بەرەو نەمان ئەڕوات (١) .

خەڵکی نیکاراگوا بە پشتیوانی و پێشڕەوی شۆرشگێڕە ساندینیستەکان خۆیان بۆ لە گۆڕ نانی حکومەتی زۆردارو مل هوڕی بنەماڵەی سوموزا گورج کردۆتەوەو ئەیانەوێ دەستی ئەمەریکا لەسەر وڵاتەکەیان کورت بکەنەوە ، هاتنە دی ئەم ئاواتەش ئەوەندەی نەماوە .



نیکاراگوا یەکێکە لە وڵاتە بچوکەکانی ئەمەریکای ناوەند ، کە لە لای ژوورەوە لەگەل وڵاتەکانی هیندوراس سلفادۆرو لای خوارەوەش

---

(١) مەبەست لە سەردەمی نوسینی کتێبەکەیە ـ ( وەرگێڕ )

بە کستاریـکاوە هـاو سنوورە •• لای رۆژهەلاتی ئـەم ولاتە دەریای « کاریبی » و لە لای رۆژئاواشەوە ئۆقیانووسی گەورە هەیە •

**روبەری ولاتەکە نزیکەی شەست هەزار میلی چوار گـۆشەیەو بـە پێی سەرژماری ساڵی ۱۹۷٤ دانیشتوانیشی ئەگەنە نزیکەی دو ملیـۆن و نیو کەس • زیاتر لە ٥۱٪ ی خەلـکەکەی لادێ نشینو ئەو ٤٩٪ کەی لە شارەکاندا ئەژین •• « ماناگوا » پایتەختی نیکاراگوایە ، کە نزیکـەی ۲۰٪ی دانیشتوانی ولاتەکەی تێدا ئەژی •**

زوربەی خەلـکی نیکاراگوا لـــە بارێـکی تفتو تاڵدا ئەژین • • نیوەی خەلـکی ئـــەم ولاتە دەرامـەتی ساڵانەیان نزیـکەی «۹۰» دۆلار ئەبێت •• لادێ نشینەکانیان دەرامەتی ساڵانەیان لە ۱٥۰ دۆلار کەمترە •• نیوەی ئەمانەش دەرامەتیان ناگاتە پەنجا دۆلار لەساڵێکدا • هەر بـە پێی هەمان سەرژماری دەولەتی ـ کە ئەوەندەش جێگای باوەڕ نیە ـ ژمارەی بێ ئیشەکان لە سەرتاسەری ولاتا لە ۲۲٪ی خەلك ئەگرێتەوە • بەلام لـە لادێـکاندا لە ۳٥٪ی زیاتر بێ ئیشو کارن ، وە لە هەندێك کاتی سـالدا ژمارەی بێ ئیشەکان لە ٥۰٪ تێ ئەپەڕن •

نیوەی خەلـکی شارەکان نەخوێنـدەوارن ، لە لادێکاندا ژمـارەی نەخوێندەوارەکان ئەگاتە ۷۰٪ ی دانیشتوان• بۆ هەر کۆمەلە خەلکێکی سەد هەزار کەسی ٦۸ دوکتورو ۱۸۲ قەرەوێلەی نەخۆشخانە هـەیە • لە هەر ساڵێکدا نزیکەی ۱۳٪ی مندالان بە نەخۆشی جۆر بـە جۆر ئەمرنو ٥۰٪ی مندالەکانی تریش لە ژیانێکی پڕ لـــە برسێتیو بێ خۆراکیـــدا ئەژین •• لە ٤۷٪ی خانوی خەلـکی نیکاراگوا لـــە بچوکترین هـۆی حەوانەوەو ژیان کـە سەرەشۆرگەو دەستشۆرە بێبەشن • لـە لادێـکانا

ئەم رادەیە ئەگاتە ٨١٪ ، لــە گەورەترین شاری نیكاراگوا ، واتا لـــە «ماناگوا»دا تەنیا لە ٢٠٪ی خەڵك ئاوی بۆری ئەخۆنەوە ، وە لـە ٩٩٪ی خەڵـكی لادێ نشینەكان تەنانەت بە ئەندازەی پێویسـت ئـاوی پاكـی خواردنەوەیان نیە •

كشتوكاڵ گرنگترین بەشی ئابوری نیكاراگوایە ، كە زیاد لە ٤٨٪ی هێزی كاری گرتۆتەوەو لە ٧٥٪ی بەروبوم دابین ئەكات • گەورە ترین بەروبومی ئەو وڵاتە بریتی‌یە لە لۆكە ، قاوە ، مۆز ، دار (تەختە) شەكر ، گۆشت •

نیكاراگوا وڵاتێـكی سەرمایەداری گرێدراوە ، كـــە ئیمپریالیزمی ئەمەریكا رۆڵێكی گەورە لە ژیانی سیـاسی‌و ئابوریدا ئەگێڕێ دەسـەڵاتی ئیمپریالیزمی ئەمەریـكا لـەم وڵاتەدا لە لایەن بۆرجوازی گرێـدراو بە شێوەی گشتی‌و دیكتاتۆری «ئەناستاسیۆ سوموزا» وە بە تایبـــەتی بەڕێوە ئەبرێت •

رادەی گەشە كردووی هێزە بەرهەم هێنەرەكانی ئەم وڵاتە لـە چاو وڵاتەكانی تری ئەمەریكای لاتینی ئاستێكی نزمی هەیە •

لە هەمو خەڵـكی نیكاراگوا نزیكەی ٦٥٠ شەش سـەدو پەنجـا هەزار كەس لە كاروباری ئابوری كشتوكاڵی‌و ٣٠٠ سێ سـەد هـەزار كەس ماسی گرتن‌و چوار هەزار كەس لە كانەكان‌و بەرد هەڵـكەندنداو شەست هەزار كەس لە كارخانە سنعەتی‌یەكانداو پەنجا هەزار كەس لـە كاروباری خانووبەرەداو چوار هەزار كەس لە دەزگاكانی كـارەباو ئاوو خزمەتگوزاری تەندروستی‌و شەست هەزار كەس لە كاروباری بازرگانی‌و بیست‌و سێ هەزار كەس لە كاروباری باركردن‌و گواستنەوەو هەمــار

سازیو دەزگای تەلەفۆنداو سەد هەزار کەس لـە دەزگـاو دامـەزراوە ئابوریو خزمەتگوزاری‌یەکانی ترا کار ئەکەن •

چینی کریکارانی نیکاراگوا لە ۱۵۰ سەدوپەنجا هەزار کرێـکاری سنعەتیو کانەکانو خانووبەرەو کشتوکاڵ پێك هاتوە ، کە بەشی هـەرە زۆریان لە دەزگاو کێڵگە کشتوکاڵی‌یەکانا کـار ئەکـەن • کرێـکارە کشتوکاڵی‌یەکانو جوتیارەکان کە هێزێـکی سێ سەد هەزار کەسی ئەبن لـە ناوچەکانی ژورو ناوەندو ناوچەکانی کەناری ئۆقیانوسی ئەتڵەسی‌دا ئەژین ، بـە کشتوکاڵی لۆکـەو قامیشی شەکرو قاوەو مـۆزو توتنو ئاژەڵداری‌یەوە خەریکن •• ئەمانەش لە ناوچـەکانی چیناندگـا ، لیۆن ، ئاینوتپ ، ماتاگالپا ، ماناگو ، بواکۆ ، ریڤاسو ئاستلی دا نیشتەجێن ، کە ئەم ناوچانە شوێنی هـەرە بەدیاری پرۆلیتاریای سنعەتیو کرێـکاری خـانوو بەرەن •

وردە بۆرجوازی‌یەکانی نیکاراگوا ژمارەیان ئەگـاتە سەدو پەنجـا هەزار کەس ، کە ئەمانەش بریتین لە خاوەن سنعەتەکانو خاوەن کۆگـا بازرگانی‌یەکانو کاربەدەستە ئیداری‌یەکانی دەولەت •• جـگە لەمانەش قوتابیو رۆشنبیرەکـان ئەگەرچی هێزێـکی کاریگـەری ئابوری‌یانە نین بەڵام لە بواری سیاسی‌دا بە وردە بۆرجوازی دائەنرێن •

**بۆرجوازی نیکاراگوا لە دوو بەش پێك هاتووە :**

یەکەمیـان ، بۆرجوازی گرێدراو کـە وەکو هاوبەشو دەڵاڵی ئیمپریالیزم کار ئەکەنو پەیوەندی ئابوری‌یان بە یەکێك لە هەرسێ گرۆ ئابوری‌یەکەی نیکاراگواوە هەیە وەکو :

[ دەستەی‌سوموزا ، دەستەی بانقـــد ئەمەریکاییەکان ، دەستـــەی بانقەکانی نیکاراگوا ] ..

دووەمیان ، بۆرجوازی نیشتمانی وەکو بەشێك لە بۆرجوازی مـــام ناوەندی نیکاراگوا کـه بـه زۆری لـــه کاروباری بازرگانی‌و سنعەتی‌و خزمەتگوزاریدا کار ئەکەن .. لە دوای بومەلەرزەکەی ساڵی ۱۹۷۲ کـه شاری « ماناگوا »ی وێران کرد ئەم بەشە بۆرجوازی‌یەیان گەلێك ئەرکی کەوتە سەرو دوچاری کێشەیەکی سیاسی توندو تیژ بوو .

بنەماڵەی ســوموزا نزیـکەی نیـو ســـەدە ئەبێت حوکمی وڵاتی نیکاراگوا ئەکەن .. ئەم بنەماڵەیە گەورە ترین بەشی دارایی‌و ئابوری ئەو وڵاتەیان بە دەستەوەیە ، زوربەی دەزگا ئابوری‌یەکانی وڵات راستەوخۆ بە خۆیانەوە بەستراوە ، یان بەشیان تیـایا هـەیە .. ریژیمی دیکتاتوری سوموزا وەکو نوێنەرێـکی ئیمپریالیزم پاسەوانی قازانجی سەرمـایەدارە گرێدراوە ناوخۆییەکان کـار ئەکـــات .. ئیمپریالیزم لەناو دەزگاکانی دەوڵەت دا دەسەلاتێـکی تەواوی هەیەو ئیمپریالیزمی ئەمەریـکا ئەرکی سەرکردایەتی کردنی ئیمپریالیزمی جیهـانی لـــەو وڵاتەدا گرتۆتـــە ئەستۆی خۆی .



## کورته مێژویەکی نیکاراگوا :

مێژوی راپەڕینی چینایەتی نیکاراگوا لەگـەل مێژوی ئەمەریـکای لاتین‌و بەربەرەکانێی دەسەڵاتە ئیستیعماری‌یەکان لەو وڵاتەدا پێـکەوە گرێدراون • هاتنی ئیستیعماری‌یە ئەوروپاییەکان بوو بـە هۆی گەشـە نەکردنی ئابوری وڵات‌و بەرگیری کردن لە هاتنە کایەی بۆرجوازی‌یەکی گەشە کردوی بەهێزی ناو خۆو رێـگرتن لـە فراوان بونی باری ئابوری وڵات • هەربەم هۆیەوە هێزە بەرهەم هێنەرەکانی وڵات لەچاو وڵاتەکانی تری ئەمەریـکای ناوەند کەمتر گەشەیان کردو ئابوری وڵات کـەوتە دواوە •

نیکاراگوا دوای ئەوە لـە نیری ئیستیعمار گەرانەی ئەسپانیاییەکان رزگاریان بو لە ساڵی ١٨٢١ دا ، کەوتنـە داوی دەسەڵاتی بازرگـانی بەریتانیاییەکانەوە • لەگەل ئەوەشدا تاکو ساڵی ١٨٧٠ هێشتا ئابوری ئـەو وڵاتە هیچ پەیوەندی‌یەکی بە هێزی وای لەگەل بازارە جیهانیە کاندا نەبو ، بەرهەم هێنانی گۆشت‌و کەلوپەلی تری کشتوکاڵی گرنگترین بەشی ئابوری نیکاراگوا بو ، کە رۆژانە لەناو خۆدا بەکار ئەهێنران •

لــە سەرتاسەری سـەدەی نۆزدەیەمدا دو دەستەی گــەورەی دەرکەوتو دەسەڵاتیان بەســـەر نیکاراگوا دا هەبو ، کە ئـەوانیشــ دو ڕێکخراوی سیاسی وەکو : [ کۆنەپارێزان] و [لیبرالەکان] بون •

ڕێــکخراوی کۆنەپارێزان نوێنەری قازانجی «لاتیفوندی»یەکـانو خاوەن مەڕو ماڵاتو «ئاژەڵدار»و بازرگانە ناوچەیەکان بو ، کە لە ناوچەی «گرانادا» دا ئەژیانو لەگـەل ڕەووشتی موستەعمەرەیی کۆنو سیستەمی سەرەتایی ئابوری گرێدراو بون •

بنەماڵەی شامورو چەندان ساڵ سەرۆکایەتی ئـــەم حزبەیان بـــە دەستەوە بو ، حزبی «لیبرال» بریتی بو لە سنعەتکارانو بۆرجوازی‌یەکانی ناوچەی «لیون»و بنە ماڵەی «ساکاسا» •• ئەم حزبە لایەنگری بازرگـانی ئازادو مودیرنیــزە کردنی ژێرخـــانی ئابوری وڵاتو دابەشـکردنو دیاریکردنی زەوی زارە هاوبەشی‌یەکانو پێك هێنانی هێزێـکی کـــار کردنی زیندو بون • چەندان شەڕی ناوخۆیی درێژ خایەن لە نێوان ئەو دو لایەنە فەرمانڕەوایەدا بەرپا بو ، هەر یەکەیان بەو مەبەستەی دەسەڵاتی تەواوی خویان بەسەر حوکمدا بسەپێنن •• ئەم ناکۆکی‌یە ناوخۆییانە بە هۆی هاندانی دەزگا ئیستیعماری‌یەکانی دەرەوە ڕۆژ بە ڕۆژ توندو تیژ تر ئــەو ••

ئەمەریکای ناوەند لەدوای چونە دەرەوەی دەسەڵاتی ئیسپانیاییەکان چەندان ساڵ لە ژێر دەسەڵاتی بەریتانیادا مایەوە •• بەڵام دەرکـــەوتنی ئەمەریکا وەکو دەسەڵاتێکی تازە هەڕەشەی لە دەسەڵاتی ئیمپەراتۆری بەریتانیا ئەکرد •• چــەندان هۆی سیاسی‌و ئابوری ڕێـگای هاتنـــە سەرکای بۆرجوازی‌یەکی نیشتمانی بەهێزیان گرتبو •

پێچەوانەی هەمو وڵاتەکانی تری ئەمەریکای لاتین ، ئەوەی کە هێزە ئیستیعمار گەری‌یەکانی پەیوەندیدار کردبو بە نیکاراگواوە تەنیا ، کانە سروشتی‌یەکانو کەرەسەی خاو نەبوو ، چونکە نیکاراگوا لەو کاتەدا ئەوەندە فراوان نەبوو کە بەروبومێکی کشتوکاڵی زەبەندی هەبێتو لە رووی کەرەسەی خاویشەوە ئەوەندە دەوڵەمەند نەبو ، بەڵکو سامانێکی بەنرخی هەبو وەکو ئەو دەریاچەو روبارانەی کە ئەتوانرا کاناڵێکی «نۆکەند» ئاوی لە نێوان ئۆقیانوسی گەورەو دەریای «کاریبی»دا تیا هەڵبکەندرێ .. ئەمەریکای ژوروو بەریتانیا لەسەر هەڵکەندنی نۆکەندێکی ئاویو بە دەست هێنانی مافی ئینحیساری خۆیان لەسەر رێگا ئاوی‌یەکان بەربەرەکانێ‌ی یەکتریان ئەکردو هەر یەکە لە لایەن خۆیەوە هەوڵو تەقەللای بۆ ئەدا .

## ١ـ دەسەڵاتی ئیمپریالیزمی ئەمەریکا

لە ناوەراستی سەدەی نۆزدەیەمدا ، لەگەل دۆزینەوەی کانی زێڕ لە «کالیفۆرنیا» وڵاتە یەکگرتوەکانی ئەمەریکا کەوتە راوێژی دروستکردنی رێگایەکی هەرزان بەها لە نێوان ئۆقیانوسی گەورەو دەریای «کاریبی»دا . لەم روەوە وڵاتە یەکگرتوەکان هەوڵێکی زۆریان دا بۆ لاواز کردنی دەسەڵاتی بەریتانیاو بە تایبەتی بۆ ئەوەی نۆکەندە ئاوی‌یەکان بە تەواوی بگرێتە ژێر دەستی خۆیەوە .

لە ساڵی ١٨٥٠ دا پەیمانی [کلیتون ـ بالۆر](١) ئەگەرچی پەیمانێکی کاتی بو ، کۆتایی بە بەربەرەکانێ کردنی نێوان هەردو وڵاتی

(١) Clyton - Bulwer .

ئەمەریکاو بەریتانیا هێناو بە پێی ئـەو پەیمانە نابێت رێـگا ئاوی‌یەکـــان بکەوێتە ژێر دەسەڵاتی هیچ لایەنێکەوە بە تەنیا •

بەڵام ئەم رێکەوتنە ماوەی کورت بو ، لە ساڵی **١٨٥١** دا شـــەڕی ناوخۆیی نێوان لیبرالەکانو کۆنە پارێزەکان دەستی پێکرد • لیبرالەکـان داوای شارەزایەکی ئەمەریکاییان کرد کە ناوی «ویلیام والـکر» بو ، بۆ ئەوەی بە هانایانەوە بێت •• والکر لە گەل هێزێکی سەربازیدا خـــۆی گەیاندە نیکاراگوا ، لە دوای ماوەیەك دەستی بە ســەر شاری «گرانادا»ی پایتەختی کۆنە پارێزەکانا گرت • والکر لە ساڵی **١٨٥٦** خۆی کرد بـــە سەر کوماری نیکاراگوا ، لە لایەن وڵاتە یەکگرتوەکانی ئەمەریکاوە بـــە رەسمیەت ناسرا •

هەوڵو تەقەللای بەریتـــانیاو وڵاتەکـــانی ئەمەریـــکای ناوەندو کومپانیایەکی رێـــگای ئاسنی ئەمەریکایی(١) ـ کە بەشێکی لە نیکاراگوادا بو لە لایەن والکرەوە دەستی بەسەردا گیرابو ـ ئەمانە بونە هۆی ئەوە کە والکر لە ساڵی **١٨٥٧** دا بە ناچاری نیکاراگوا بەجێ بهێڵێ •

لە دوای رۆیشتنی والکر ، باری سیاسی وڵات بۆ ماوەی ٣٠ ســـاڵ سەقامگیر بو،ئەو روژگارە لەگەل ریژیمەکانی کۆنە پارێزی کە قەوارەی نیمچە ژێردەستەیان ئەپاراستو رێـــگای لـــە گەشەکردنی ئابوری وڵات ئەگرت ، جیا ئەکرێتەوە • لە ساڵی **١٨٦٧** دا وڵاتە یەکگرتوەکان ئـــەو رێکەوتنەی نێوان خۆیانو بەریتانیای رەت کردەوەو راستەوخۆ پەیمانێکی لەگەل دەوڵەتی نیکاراگوادا مـــۆر کرد ، بە پێی ئەو رێکەوتنە مـــافی ئینحیسار کردنی رێـــگا ئاوی‌یەکانو پاراستنی هێزە سەربازی‌یەکانی لـــە دەورو بەری رێـــگا ئاوی‌یەکاندا بە دەست هێنا •

---

(١) U. S. Railroad Baron Cornelius Vanderbilt .

لەگەل نزیك بوونەوەی سەدەی بیستەمدا گۆڕینێکی گەورە لـــە بواری ئابوری‌و سیاسەتی نیکاراگوادا هـــاتە دی •• فراوانبونی رادەی کشتوکـــاڵی قاوەو ناردنی بۆ بازاڕەکـــانی دەرەوە باری ئابوری وڵاتی گۆڕی • بۆرجوازی کشتوکاڵ کار گەشەی کرد ، لـە روی سیاسی‌یەوە حکومەتی کۆنە پارێزەکان لە ساڵی ۱۸۹۳ دا کۆتایی پێ هات‌و ریژیمی لیبرالی [خوزەسانتوس زیلایا](۱) جێگای گرتەوە کە تاکو ساڵی ۱۹۰۹ی خایاند • زیلایا بە پێی ئەو رێبازەی کە «گواتمالا» بیست ساڵ لـــەوە بەر ئامادەی کردبو دەستی کرد بـــە جێـــەجێ کردنی « ریفۆرمـــە لیبرالی‌یەکـــان » بە نهێنی •• زیلایا دەستی کرد بـــە مودیرنیزە کردنی روالـــەتی موستەعمەرەیی‌و گونجاندن‌و یەك لایەنی کردنی دەســـەڵاتی سیاسی‌و ئابوری • زەوی‌و زارە هەرەوەزی‌یەکانی بـە ســـەر خـاوەنی تایبەتیدا دابەش کرد • رێـگا ئاسنی‌یەکان‌و دەزگا کانی تەلگراف‌و دەزگا خزمەتگوزاری‌یەکان فراوان بون • چەندان بانقی دەوڵەتی دامەزران •

ریژیمی زیلایا کردنەوەی دەرگاکانی وڵاتی بەروی سەرمایەدارانی دەرەوەدا لـــە ریژیمـــە کۆنەپارێزەکانی پێش خۆیەوە وەر گـرت •• سەرمایەی ئەمەریکایی جێگای سەرمایەی بەریتانیای گرتەوە ، بە تایبەتی لە بواری شت ناردنە دەرەوەدا وەکو : قاوە ، زێڕ ، گۆشت مـــۆز •• زیلایا بە پشتیوانی ئەمەریـــکایەکـــان ، ئینگلیزەکانی لـــە کەنارەکانی ئاتلانتیکی نیکاراگوا کردە دەرەوە •

شیرازەی دەستدرێژی ئیمپریالیزمی ئەمەریـکا زیاد لـەوەی کـە ریژیمـــی زیلایا بتوانێت بەرێوەی بـــات ، تێپەڕی کـــرد • وڵاتـە یەکگرتووەکان تەنانەت دوای مـــۆر کردنی پەیمانی ۱۹۰۳ لەگـــەل

---

(۱) Jose Santos Zelaya .

«پاناما» دا له بارەی نۆکەندی «پاناما»وه ‥ ئەیویست لەگەل ئەوەدا کـــه هەمو رێـگا ئاوی‌یەکانی نیکاراگوای لـــه ژێر دەست‌دا بو ، دەســەڵاتی سیاسی‌و ئابوری خۆی له ئەمەریکای ناوەندا بچەسپێنێ‌و سەقامگیری بکات •

ریژیمی زیلاش ئەیویست له رێـگای فراوانکردنی پەیوەندی خۆیەوه لەگـــەل ولاتانی دەرەوەدا جـۆره سەربەخۆییەك بۆ خـــۆی پێك بێنێت ، زیلایا مـــافی دەستگرتنی بەسەر رێـگا ئاوی‌یه کانی نیکاراگوای بـه ئەمەریکا نەدا ‥ سنوری بۆ خستنه کـاری سەرمایەی ئەمەریـــکایی له ولاتدا دانا ‥ ئەیویست ئیمتیـــازی هەڵـکەندنی نۆکەندێـکی ئـاوی بدات بـــه چـــەند کومپانیایەکی ژاپۆنی ، هەروەها زیلایا له ساڵی ١٩٠٩ دا ئەیویست قەرزێکی ٥ر٢ ملیۆن لیرەیی له یەکێك لـه دەزگا ئابوری‌یەکانی بەریتانیا وەر بگرێ •

کوشتنی دو کەس لـــه کرێـــگرته ئەمەریکاییەکان تورەیی‌و رقی دەوڵەتی ئەمەریکای زۆر تر کرد • ئیمپریالیزمی ئەمەریکا لـــه ســاڵی ١٩٠٩ دا کەوته سەر تەگبیری ئەوه که رێژیمی زیلایا له ناو ببات •

ولاته یەکگرتووەکان پشتگیری یاخی بونی کۆنه پارێزەکانی کرد له دژی ریژیمی زیلایا • له ساڵی ١٩١٠ دا پەیمانێك له نێوان رێژیمی تازەی کۆنه پارێزان‌و ئەمەریکادا مۆر کرا ، کـــه بـه پێی ئەو پەیمانه نیکاراگوا بو بە ولاتێـکی نیمچـه ژێر دەستەیی سیاسی‌و دارایی کومپانیا ئەمەریکاییەکان • ئەمەریکا توانی دەسەلاتی خۆی به سەر قەرزو قۆڵـەی دەرەوەو دەرامەتی گومرکی نیکاراگوادا بسەپێنێ ، له دوایدا بـه پێی

رێکەوتننامەی «بریان-شامورو»(١) لە ساڵی ١٩١٤ دا لە لایەن دەوڵـەتی کۆنـــە پارێزەوە «ئادولفو دیاز»(٢) مافی ئینحیسار کردنی نۆکەندێك و هۆرردوگایەکی دەریایی بەرامبەر بە سێ ملیۆن دۆلار درا بە دەوڵـەتی ئەمەریـکا •

هەروەها رێکەوتننامەی قەرزو قۆڵە لەگـەل بانقە ئەمەریکاییەکاندا مۆر کرا کە رێـگای ئاسن و بانقی گەلی وڵاتی ئەگرتەوە • دەستێوەردانی ئەمەریکا بۆ ناو کاروباری ناوخۆی وڵات لە ساڵی ١٩٠٩ دا بو بە هـۆی زیاتر توندو تیژ کردنی ناکۆکی نێوان کۆنە پارێزان و لیبرالەکان • شەڕی ناوخۆیی نیکاراگوا هەڵگیرسا ، بەرە بەرە کۆتایی بە ریژیمی زیلایا هات• پاراستنی کۆنە پارێزەکان لە لایەن ئەمەریکاوە و پشتگیری کردنیان بو بە هۆی پێك هێنانی یەکێتی‌یەکی ناسیوتالیستی لـــە لیبرالە کۆنە کـــان و لایەنـگرانی زیلایاو ئەو جوتیارانەی زەوی‌وزاریان لێ سەندرابۆوە •

لـــە ساڵەکـــانی ١٢ ـ ١٩١٤ دا بـەلای کـەمەوە دە راپەڕینی چەکدارانە لە سەرتاسەری وڵاتی نیکاراگوادا ساز کرا • ساڵی ١٩١٢ لـە سەر داخوازی « ئادولفو دیاز » ـ سەر کۆماری کۆنە پارێزەکان ـ ٢٧٠٠ چەکداری دەریایی ئەمەریکایی بۆ سەرکوتکردنی راپەڕینی لیبرالەکان هاتنە ناو خاکی نیکاراگواوە •

لە دوای سەرکوتکردنی راپەڕینەکـــە دیسان ژمارەیەکیان لـــە نیکاراگوادا مانەوە ، لەگەل ئەوەشدا چەکدارە ئەمەریکاییەکان نەیانتوانی ئەو راپەڕینە چەکداری‌یە کپ بکەنەوە • هەروەها راپەڕینی چەکدارانەو مانگرتنی هەمە لایەنیانە لە دژی کومپانیا ئەمەریکاییەکان درێژەی کێشا ••

(١) Bryan - Chamorro .
(٢) Adolfo Diaz.

له ساڵی ١٩٢٤دا هەڵبژاردنی گشتی لەژێر چاودێری ئەمەریکادا کرا ، لەو کاتەدا ئەمەریکا نەخشەی ئەوەی کێشا بو کە هێزە سەربازی‌یەکانی خۆی لە نیکاراگوا بکێشێتەوە .. راپەرینی کۆمەڵانی خەڵك لە لایەن لیبرالە چەکدارەکانەوە ساز کراو شەڕی ناوخۆیی لە ساڵی ١٩٢٦ دا سەرلەنوێ دەستی پێکردەوە . لە ماوەی مانگێکدا چەکدارە دەریاییە ئەمەریکاییەکان ناچار بون گوایە بۆ «پاراستنی گیانو کەلوپەلی ئەمەریکاییەکان » و لە راستیشدا بۆ پاراستنو هێشتنەوەی دەسەڵاتی ئەمەریکا لە ئەمەریکای ناوەند بگەڕێنەوە بۆ وڵات . بە تایبەتی لەو کاتەدا کە ریژیمی چەپخوازی «مەکسیك» پشتگیری لە لیبرالەکان ئەکرد .

ئەمەریکا ئەیویست لەو کاتەدا رێکەوتنو سازاندنێك لە نێوان لیبرالەکانو کۆنە پارێزەکانا پێك بێنێ ،لە مانگی مایسی ١٩٢٧ دا نوێنەری وەزارەتی دەرەوەی ئەمەریکا توانی لیبرالەکان رازی بکات کە پەیمانی ئاشتی لەگەل کۆنە پارێزەکانا مۆر بکەن . چەکدارە دەریاییە ئەمەریکاییەکان بە بیانوی «پاراستنی یاسا»وە تا کۆتایی هەڵبژاردن لە نیکاراگوا مانەوە .

هەمو رابەرو سەرکردەکانی سوپای لیبرالەکان رێکەوتن کە چەکەکانیان دابنێنو سەرپێچی لە مەرجەکانی ئەمەریکا نەکەن ، جگە لە «ئوگوستو سزار ساندینو »(١) . نەخشەی ساندینو ئەو بو کەی دژی رێگای سازاندنو چارەسەری سیاسیانەی

---

(١) Augusto Cesqrsandino.

ئەمەریکایەکان بوەستێ •• وڵاتەکەی ناچار کرد کە
ماوەی شەش ساڵ وڵاتی ئەمەریکای لاتین دوچاری
یەکەمین شـــەڕی شۆڕشگێڕانە بـکاتو ڕۆڵی دژی
خەڵـکی دەوڵەت بە ئاشکرا بخاتە ڕوو •

ڕاپەڕینی چەکـــدارانەی لەشکری شۆڕشـگێڕی ساندینو دژی
ئیمپریالیزمی دەست درێژکاری ئەمەریکا قۆناغێـکی تازەیە لـــە مێژوی
ڕاپەڕینی خەڵـکی نیکاراگوادا • درێژە کێشانی ئەم ڕاپەڕینە بو بە هـۆی
هەڵچوونی خـــەڵكو هـــەستی شۆڕشگێڕانەی دژ بە ئیمپریالیزم لـــە
نیکاراگواو سەرتاسەری ئەمەریکای ناوەندو ڕادیکالیزە کردنی دروشمو
بەرنامەی ڕاپەڕینی خەڵك •• ئەمەریکا دوچاری گێژاوێك بو بو کە خۆی
دروستی کردبو • پایەی کۆمەڵایەتی ڕاپەڕینەکەی ساندینو گەلێك لەوە
فراوانترو بەهێزتر بو کە کۆنە پەرستانی ناوخۆ بتوانن بەسەریا زاڵ بنو
لەناوی بەرن •

## ٢ـ یەکەمین شەڕی ئازادیخوازانە

بەربەرەکانێی نێوان دو لایەنی سەرەکی ئالیگارشی نیکاراگـــواو
شەڕ کردنیان لەگەل ئیستیعمار گەراندا تەنیا بەشێکە لە مێژوی وڵاتەکە •
ئەوەی کە گرنگترە ڕاپەڕینی خەڵکە لەژێر زۆرو ستەمی نیکاراگـــواو
ڕاپەڕین دژی چینە کۆنە پەرستە فەرمانڕەواکان لە لایەکەوەو تالانکەرانی
بێگانەش لە لایەکی ترەوە •• ڕاپەڕینی شۆڕشگێڕانەو دژی ئیستیعماری
خەڵکی نیکاراگوا مێژویەکی دورو درێژی هەیە •• ئەم ڕاپەڕینـە لـــە
سەرەتای سەدەی بیستەمدا لەگەل گۆڕینی سیستەمی سەرمایەداری جیهانی
بە ئیمپریالیزم خاسیەتێکی دژی ئیمپریالیستی تایبەتی پەیدا کرد •

ریفۆرمە لیبرالی‌یەکانی ساڵی ۱۸۹۳ لە لایەکەوەو هاتنی سەرمایەی دەرەوە بۆ ناوخۆی وڵات لەلایەکی ترەوە ، راپەڕینی شۆڕشگێڕانـــەی نیکاراگوای زیاتر توندو تیژ تر کردەوە •• ئەوەی شیاوی باسکردنـــە بەشێکی زۆری زەوی‌و زاری وڵات کە بە دەست خەڵکە رەسەنەکانـــی نیکاراگواوە بون‌و بە شێوەی هەرەوەزی کشتوکاڵیان تیا ئەکرد « ریفورمی زەوی‌و زار » بەمانا پێك هێنانی مڵکدارێتی تایبەتی‌و دەرهێنانی زەوی‌یەکان لە دەست خاوەنە کۆنەکانیان •• ئەمـــکارە زەمینـــەیەکی لـــە باری بـــۆ راپەڕینی خەڵك لە پێناوی وەرگرتنەوەی زەویەکانیانا ساز کرد •

هەروەها ، هاتـــنی سەرمایـــەی ئینحیســـاری دەرەوەو ریفورمـــە لیبرالی‌یەکان بونە هۆی پێك هاتنی هـــێزی کارو پرۆلیـــتاریای نـــویێ • مودیرنیزە کردن کە خاوەن زەوی‌یە بچوکەکانی لەناو برد بو بە هـــۆی ئەوە جوتیارەکان ببن بە کریکاری کشتوکاڵی لە کێڵگە تازەکاندا • لـــە هەمان کاتا سەرمایەی کومپانیـــا ئینحیساری‌یـــەکانی ئەمەریـــکا لە دەزگـــاو دامەزراوەکانی بەرهەم هێنانی مۆزو تەختەو کەرەسەی خاودا بو بە هۆی دامەزراندنی چەندان مەڵبەندی تازەی کرێکاران •

لە ئەنجامدا بە زنجیرە مانگرتنی رەخنە گرانە لە لایەن کرێکارانی ئەو مەڵبەندانەوە ساز ئەدران • وەکو راپەڕینی مانگی مایـی ۱۹۲٦ لـــە دژی کودتای « شامورو » کە کرێکارانی کومپانیای «یۆنایتدفرۆت»ی(۱) ئەمەریکایی کردیان‌و بەشێکی زۆری وڵاتی نیکاراگوای گرتەوە •

لەم روەوە لە کاتێکدا « ساندینۆ » دژی ئیمپریالیزمی ئەمەریکا چەکی هەڵگرت ، ئەوە سەرەتای راپەڕیـــن نەبو ، بەڵکو درێژە دان بو بە خەباتی چەکدارانەی دژ

(۱) United Fruit.

به ئیمپریالیزم له نیکاراگوا دا •

« ئاگوستۆ سزار ساندینۆ » لـه بنەماڵـەیەکی کشـتوکاڵ کار دا پەروەردە بوبوو ، ماوەیەکی زۆر له کومپانیا ئەمەریکایيەکانا خەریـکی کار کردن بو •• له ساڵەکانی ٢٣ ـ ١٩٢٦ دا له کومپانیا نەوتیەکانـی ئەمەریکادا له « مەکسیك » کاری ئەکرد • ئەمه له کاتێکدا بوو راپەڕینی کرێکاران له وڵاتدا بڵێسەی سەندبوو ، ساندینۆ له ساڵی ١٩٢٦ گەڕایەوە بۆ نیکاراگوا ، له کاتێکدا راپەڕینی لیبرالی دەستی پێکردبو له کارگەیەکی زێڕ پاڵاوتن له کانەکانی « سان ئەلبتۆ » دەستی کرد به کار کردن •• به گورجی هێزە لایەنگرەکانی خۆی کۆ کردەوەو دەستی به راپەڕیـن کرد•له مانگی مایسی ١٩٢٧ دا تەنیا رابەرێك بو که مەرجەکانی صوڵحە داسەپاوەکەی ئەمەریکای قبوڵ نەکردو خیانەتی به وڵاتەکەی نەکرد •

ساندینۆ کمونیست نەبو ، بەڵام ئاگاداری ناوەڕۆکـی راپەڕیـنی چینایەتی بو ، ئەو ناسیونالیستی‌یەکی دژ به ئیمپریالیزم بو ، له بەرنامەی سیاسی کار کردنیا مافی چارەنوس‌و فەرمانڕەوایی نیشتمانی بەرامبەر بـه ئیمپریالیزمی ئەمەریکا دانابو • داوای یاسای بنچینەیی و چارەسەر کردنی زەوی‌و زاری ئەکرد ، لەشکری گەلی ساندینۆ که [ لەشکری بەرگـری له دەسەڵاتی گەلی نیکاراگـوا ] (١)ی نـاو بوو بـه زۆری لـه جوتیارو کرێکاران پێك هاتبو •

رێکخراوە سەرەتاییەکانی لەشکرەکەی له کانه زێڕەکانی « ســان ئەلبنۆ »وە دەستی پێکردو به گورجی پەرەی سەند • لەو کاتەدا بێزاری لـه ناوچەکانی ژوروو رۆژ هەڵاتی نیکاراگوا به هۆی بێکاری‌و مەسەلەی

---

(١) Armyto Defend Nicaraguan National Sovereignty.

گیـرو گرفتی زەوی‌وزارو گیـزاوی ئابوری‌یەوە هـەموو لایەکی گرتبۆوە •• ئەم ناوچانە بە هۆی ئەو هۆیانەی سەرەوە بون بە گۆڕەپانی، ئەصلی خۆ گورج کردنەوەو رێکخستنی لەشکری ساندینۆ •

جگە لە جوتیارانو کرێکاران ، ساندینۆ سودی لـە یارمەتیدانو هاریکاری بۆرجوازی‌و ، بۆرجوازی بچوكو هەندێك نوێنەرانی کۆنگرە وەر ئەگرت • بەلام لەشکرەکەی تەنیا بریتی بو لە جوتیارانو کرێکاران ، کە توانی لە سالی ١٩٢٦ دا شەڕی دژی ئیمپریالیستی‌و ئازادیخوازانەی گەلی هەلگیرسێنێ •

ئەگەرچی ولاتە یەکگرتوەکان لە روی کەرەسەی جەنگی‌و چەكو جیەخانەو تفاقی شەڕەوەو توانای سوپایی‌و هێزی ئاسمانی‌یەوە زۆر بـە توانا بو ، بەلام بەرامبەری شەڕی شۆرشگێڕەکانی پێ نەئەکرا ، لـەو روەوە دوچاری ئەو زیادو کەمی‌و ناکۆکی‌یانە بو کـە چل سـال دوای ئەوەش لە ڤیتنامدا جارێکی تر تاقی کردەوە • لەشکری ساندینۆ گەلێك چـەكو کەرەسەی تەقەمەنی خۆی لە چەکدارە ئەمەریکایەکان بە تالان ئەگرتو بە گورجی لە هەموو جموجولەکانی لەشکری ئەمەریکا ئاگادار ئەبو ئەویش بەهۆی خەلكو دانیشتوانی ناوچەکانەوە •

لەگەل ئەو هەمو پڕو پاگەندەیەدا کە ئەکرا ، چەکدارە دەریایە ئەمەریکایەکان هـەرگیز نەیانتوانی باری سەرنجی خەلـکەکە بۆ لای خۆیان رابکێشن ، هەروەها رەفتاری پۆلیسی‌یانەیان بـە تەواوی هـانی خەلـکی ئەدا بۆ راپەڕین •• تەنانەت زوربەی ئەو سـەربازە نیـکارا گوایانەی کە لە ژێر فەرمانی ئەفسەرە ئەمەریکایەکانا شەڕیان ئەکرد ، لە زۆر بواردا سەر پێچی‌یان لە فەرمانەکانی سەرکردەکانیان ئەکرد •

لە بواری نێو نەتەوەیشدا ئەمەریـکا لـە بارێـکی ئەوەندە لەباردا

ەبو ، بە تایبەتی لە ئەمەریکای لاتین دا • خەڵك بە زۆری پشتگیری‌یان لە ساندینۆ ئەکرد رابەرە سیاسیەکانو رۆشنبیران لە دژی دەست درێژی ئەمەریکاییەکان هەمویان یەکیان گرتبو ، کۆمیتە هاریکاری‌یەکانی مەکسیك‌و هیندۆراس گەلێك چالاکی‌یان فراوان بو ، تەنانەت ژمارەیەکی زۆری خەڵکە پێشکەوتووەکانی وڵاتی ئەمەریکای لاتین چونە ناو لەشکری ساندینۆوە •

زیان لێ کەوتنی زۆری هێزەکانی ئەمەریکاو بڵاو بونەوەی دەنگوباسی جەنگ بوو بە هۆی خولقاندنی راپەڕینێکی دژی جەنگ لە ئەمەریکاداو گەلێك خۆ نیشاندانو رێ پێوان لە شارەکانی ئەمەریکادا ساز درا • فیدراسیۆنی کرێکارانی ئەمەریکا بە رەسمی رەخنەیان لە دەستێوەردانی ئەمەریکا بۆ کارو باری ناوخۆی نیکاراگوا گرت •• رودانی گێژاوی گەورەی جیهانی ئەوەندەی تر زەمینەی رەخنە گرتنی لەو جەنگە لەبار تر کرد • کاتێك ئەوە ئاشکرا بو کە وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا ناتوانێت لەروی سەربازی‌یەوە لە نیکاراگوادا سەرکەوتو بێت ، حزبی دیموکراتی ئەمەریکا چووە بەرەی رەخنە گرانی جەنگەوە •

بەو جۆرە زیانی زۆری شەڕو شکستی سەربازی لە لایەکەوەو زۆرو پاڵەپەستۆی فیکری خەڵك لەناو خۆو دەرەوەی ئەمەریکادا لەلایەکی ترەوە دەوڵەتی ئەمەریکای ناچار کرد کە لە ساڵی **١٩٣١** دا بەشێکی زۆری چەکدارە دەریاییەکانی خۆی لە نیکاراگوا بکێشێتەوە • لە جیاتی ئەمە ئەمەریکا دەستی کرد بە مەشق پێکردنی هێزە سەربازی‌یەکانی نیکاراگواو پڕچەك کردنیان بە تازە ترین جۆری چەکی مودیرن • ئەو هێزە سەربازی‌یە کە ناوی «پاسەوانی گەلی» بو رۆڵێکی گەورەی لە سەرکوتکردنی خەڵکی نیکاراگوادا گێڕا •

کاتێك ئەمەریکا لە ساڵی **۱۹۳۳** دا هەموو سەربازەکانی خۆی لە نیکاراگوادا کێشایەوە ، ئەو پاسەوانە گەلی‌یەی لە سەرەوە باسکراوە خۆی ئامادە کرد تاکو ئەرکی جێگری چەکدارە ئەمەریکاییەکان بە باشی بەڕێوە ببات •

ئەوەی کرا بە سەرۆکی بەناو «پاسەوانە گەلی»یەکان ، کۆنە دەلاڵێکی ماشین فرۆشی فیلادلفیایی بو کە ناوی «ئاناستاسیو سوموزا گارسیا »بۆ(۱) ، ماوەیەك خزمەتی بونیادی «راکفلر»ی کردبو ، سوموزا ئەگەر چی لە ساڵی **۱۹۲۶** دا بەشداری راپەڕینی لایەنگرانەی یاسای بنچینەیی کردبو ، بەڵام هیچ لێ وەشاوەیەکی گرنگی سەربازی نەبو لە جیاتی ئەمە بە هۆی ئەوەوە کە زمانی ئینگلیزی باش ئەزانیو پەیوەندی‌یەکی بە تینی لەگەل دیپلۆماتە ئەمەریکاییەکانا هەبو کرا بە سەرکردەی پاسەوانی گەلی •• هەروەها خێزانەکەشی یەکێك بو لە دەستو پێوەندەکانی دەرباری «خوان ساکاسا»(۲) کە لە ساڵی **۱۹۳۲** دا لە لایەن ئەمەریکاوە کرا بە سەرکۆماری نیکاراگوا •

ساکاسا ، کاتێك بو بە سەرکومار زۆر هەوڵی دا پاسەوانی گەلی بخاتە ژێر رکێفی خۆیەوە • بەڵام سوموزا نەك نەچوە ژێر فەرمانیەوە بەڵکو بە هۆی پەیوەندی‌یەوە لەگەل لیبرالەکانا خۆی بۆ سەرکۆماری ساڵی **۱۹۳۵** دانا کە هەڵی بژێرن • کۆنە پارێزەکانو ساکاسا زۆر بە توندی بەرهەڵستی وەستانو خۆیان لە هەڵبژاردنەکە کێشایەوەو داوایان لە ئەمەریکا کرد کە سوموزا تەمێ بکات •• سوموزا بە سەرکۆمار

---

(۱) Anastasio Somoza Garcia.

(۲) Juan Sacasa.

هەڵبژێردرا ، تا کاتی کوشتنی ماوەی بیست ساڵ نیکاراگوای وەکو مڵکی تایبەتی خۆی بەڕێوە ئەبرد •

لەگەل کشانەوەی سەربازە ئەمەریکاییەکانو دانانی سوموزا بە سەرۆکی پاسەوانی گەلی لە ساڵی ١٩٣٣ دا ، ریژیمی بەکرێگیراوی نیکاراگوا ویستی هێزە لایەنگرەکانی ساندینۆ لە راپەڕینەکە دور بخاتەوە ، لەم روەوە دەستی کرد بە گفتوگۆی ئاشتییانە لەگەل ساندینۆدا ، لەو رێکەوتننامەیەدا کە لە مانگی شوباتی ساڵی ١٩٣٣ دا مۆر کرا ، ساندینۆ بەوە قایل بو بەرە بەرە چەکدارەکانی خۆی چەك بکات ، لە جیاتی ئەمەش دەوڵەت قایل بو کە ژمارەیەك لە چەکدارەکانی ساندینۆ لەگەل ساندینۆ بە چەکداری بمێننەوە •

نێو نەتەوەییەکان تەنیا هێزێك بون کە بەر پەرچی چەك داماڵینو رێکەوتننامە ئاشتییانەکەی وەستانو لە ساڵی ١٩٣٣ دا بلاویان کردەوە کە مۆر کردنی ئەو رێکەوتننامەیە بەو جۆرە خۆ بە دەستەوە دانو خیانەتە بە تەواوی خەڵکی نیکاراگوا •

کۆمینترنەکان داوایان ئەکرد درێژە بە راپەڕینەکەی ساندینۆ بدرێ لە پێناوی لەگۆڕ نانی کۆنە پەرستانی ناو خۆی نیکاراگوا دا •

دوای مۆر کردنی رێکەوتننامەکە ساندینو لە ناوچە شاخاویەکانی سکاڤیاەو(١) لادێکانی ئەو ناوچەیەدا مایەوە ، دەستی کرد بە رێکخستنی هەرەوەزی لادێکان •• بەلام لێکدانی ناوبەناو لە نێوان

---

(١) Segovia .

چەکدارەکانی ساندینۆو پاسەوانە گەلی‌یەکانا روی ئەدا • ساندینۆ ناچار بو بانگکردنەکەی دەوڵـەتی «ساکاسا» قبوڵ بـکات کـە داوای کردبو ساندینۆ بچێت بۆ «ماناگوا» بۆ گفتوگۆ کردن •

سۆموزا بڕیاری ئەمەریکای بۆ کوشتنی ساندینۆو راوێژ کارەکانی وەر گرتو دەمودەس فەرمانی دەرکرد کە بیانکوژن ، لە ۲۱ی شوباتی ۱۹۳٤ دا لە کاتێکدا ساندینۆو راوێژ کارەکانی لە میوانداریێتی «ساکاسا»ی سەرکۆمار ئەگەڕانەوە دەستەیەك لـە پاسەوانە گەلی‌یەکان دەستریژیان لێکردنو هەمویان کوشتن • رۆژی دوایی هێزەکانی سوموزا پەلامارێکی سەرتا سەری‌یان بردە سـەر پاشماوەی چەکدارەکـانی سـاندینۆو هەرەوەزیەکانی ساندینیست لە ژورووی وڵاتداو زیاتر لە ۳۰۰ خـانوو بەرەی لادێـکانی لایەنگری ساندینۆیان روخاند •

بەمجۆرە یەکەمین قـۆناغی راپەڕینی ئازادیخوازانەی گـەلی لـە نیکاراگوا تێـکشکاو راپەڕینەکە بۆ ماوەی نزیکەی چارەکە سەدەیـەك کپ بۆوە •

خەڵـکی نیکاراگوا گەلێك دەرسیان لەم نوشوستی‌یە وەر گرت ، هەلو مەرجی نێو گەلانو لاوازی راپەڕینی جیهـانی دژ بـە ئیمپریالیـزم لـە لایەکەوەو نەبونی پەیوەندی تەواو لە نێوان کرێـکارانو جوتیارانـدا ، ئەمانە بە شێك بون لـەو هۆیانەی کە ماوەیان نەدا ساندینۆ لـە جەنـگی دژ بە ئیمپریالیزمدا سەرکەوتو بێتو درێژە بە جەنگە ئازادیخوازی‌یەکەی بدات • لەگەڵ ئەمەشدا چەندان هۆی تر هەبـو ، بـۆ ژێـر کـەوتنـی راپەڕینەکەی ساندینۆ • نزمی ئاستی هۆشیـاری سیاسی ـ ئایدیۆلۆجی ساندینۆو هاوڕێـکانی بو بە هۆی ئەوە کە ساندینۆ نەتوانێ ریزەکـانی

خەڵك لە دژی خەڵك جیا کاتەوە • قبول کردنی پێشنیاری چەك دانان و دوابەدوای ئەودا گفتوگۆی دڵپاکانە لەگەل سەرکۆمارو سوموزادا یەکێك بو لە هەڵە گەورەکانی ساندینۆ کە لە هەمان جیا نەکردنەوەی ریزەکانی دوژمنەوە هاتبو • هەروەها نەبونی ئۆرگان و رێکخراوو رێکخستنی سیاسیو سەربازیو پەنا بردنە بەر کار کردنی تاکە کەسیانەی ساندینۆ بو بە هۆی ئەوە کە لە دوای کوشتنی ساندینۆ پاشماوەی چەکدارەکانی بە گورجی لەناو چون • چەند کەسێکی تر لە سەرکردەکانی لەشکرەکەی لە چیاکاندا مابونەوە بەڵام لە بارەی سیاسیەوە توانایەکی ئەوتۆیان نەبو کە درێژە بە راپەرینەکە بدەن و یەك لە دوای یەك هەموویان لەناو چون •

## ٣ـ مەحکومبونی دەسەلاتی سوموزا

لە ساڵی ١٩٣٦ سوموزا لە دوای کوشتنی ساندینو توانی دەسەلاتی سەرکۆماری بگرێتە دەست و ساکاسا لە سەرکۆماری بخات • زیاتر لە ٤٠ ساڵ تێپەری کە سەرکۆماری بە میرات بۆ بنەماڵەی سوموزا ئەمێنێتەوە • ریژیمی دیکتاتۆری سوموزا وەکو نوێنەری ئیمپریالیزمی ئەمەریکا لەلایەك و بۆرجوازی گرێدراوی نیکاراگوا لە لایەکی ترەوە کاری ئەکرد بنەماڵەی سوموزا گەورە ترین دەستەو کۆمەڵی ئابوریو دارایی نیکاراگوان •

کاتێك سوموزا لە ساڵی ١٩٣٦ دەسەلاتی گرتە دەست ئەوەی پێی ئەنازیو بە پشتیوانی خۆی دائەنا ئیمپریالیزمی ئەمەریکاو پاسەوانی گەلی بوو • بەلام بەرەبەرە پایەگای سیاسی خۆیو یەکێتی لەگەل بەشە بۆرجوازییەکانی نیکاراگوادا لە دەست دا •

پاسەوانە گەلی‌یەکان ژمارەیان ٧٥٠٠ حەوت هەزراو پێنج سەد کەس بون ، سەربازە پاسەوانەکان لادێیی بونو ئەفسەرەکانیشیان کوڕی ئەفسەرە کۆنەکان بون ، جگە لە بنەماڵەی سوموزا هیچ ئەفسەرێك پایەو پلەی لە «نەقیب» بەرەو ژورتر نە ئەڕۆیشت •

ئەمڕۆکە(١) ، کوڕی سوموزای یەکەم کە ناوی «سوموزا دبایلی» یە سەرۆکی پاسەوانەکانە ، نەوەی سوموزای یەکەم فەرماندەی لەشکری ١٥٠٠ هەزارو پێنج سەد کەسی دژی خراپکاری‌یە • لەناو پاسەوانە گەلی‌یەکانا دەزگایەکی سیخوڕی تایبەتی هەیە کە هەمو جۆرە سەرپێچی‌و بێزاری‌یەك بە نهێنی لەناو ئەبات •

پاسەوانە گەلی‌یەکان لە سەرەتاوە لەژێر چاودێری راوێژ کارە سەربازی‌یە ئەمەریکایەکانا فێری مەشق ئەبونو پەروەردە ئەکران ، زۆر هەوڵی ئەوەیان لە گەلدا ئەدان کە دڵسۆزی ئەمەریکاو وەفادار بن پێ‌ی • پاسەوانەکان خانو بەرەی باش‌و نەخۆشخانەی تایبەتی‌و قوتابخانەی جیاوازیان هەبو ، تەنانەت بازاڕو فرۆشگای تایبەتیان بۆ ئەکردنەوەو لە هەمو رویەکی ژیانەوە لەگەل زوربەی خەلکەکانی ترا جیاوازی یەکی تەواویان هەبو • هەرچەند موچەو مانگانەکانیان ئەوەندە زۆر تر نەبو بەلام بەرامبەر بە دڵسۆزی‌و وەفاداری یان دوا رۆژیان بۆ مسۆگەر کرابو ،زوربەی ئەفسەرەکانیان لە دەزگاو دامەزراوەکانی تری دەوڵەتدا کاری تریان ئەکردو موچەو مانگانەی تریان وەر ئەگرت • • بە زۆری سەرۆکی دایەرەو دەزگاو دامەزراوەکانی دەوڵەت لە ئەندامانی لێهاتووی پاسەوانە کان دائەنران • بە گشتی بەشیان هەبو لە قازانجی

---

(١) مەبەست لە سەردەمو کاتی نوسینە وەی کتێبەکەیە ـ **وەرگێر**

قومارخـــانەو تیاترۆخانەو بازاڕی ڕەش‌و قاچاخ چیەکـــاندا ، هـــەر ئەفسەرێکی پاسەوانی وەفادار دوای ئەوە کار کەنار [تەقاویت] ئەکرا لەو کومپانیانە دائەمەزران کـــە لـە ژێر چاودێری تایبـــەتی بنەمـــالەی سوموزادابون • زوربەشیان لە دایەرەکانی دەولەت دا دەلاڵی‌یان ئەکردو بە پارە کاروباری خەڵکیان جێبەجی ئەکرد • هـەر کات لـە هـــەر ئەفسەرێك دو دڵ بونایە بە گورجی لە ریزەکـانی پاسەوانیـدا دوریان ئەخستەوە •

ئەفسەرە پاسەوانیەکان ئەوەندە لەم لاو لەو لاوە دەستیان ئەچو بە قازانجی هەمە جۆرەدا کە پێویستیان بە هیچ جۆرە گۆڕین‌و پێشکەوتنێکی کۆمەڵ نەبو • ئەوانە زۆر باش ئەیانزانی کـە هـەر جۆرە گۆڕانێـکی سیاسی‌و کۆمـــەلایەتی لە ولاتدا رو بدات ئەوان بە پێ‌ی ئـــەو گۆڕانە بەشێك لـە قازانجی بێ سنوریان لـــە دەست ئەچێت • خەڵـکی زۆر بێزیان لێ ئەکردنەوەو بەردی رەشیان لێ هـەڵ ئەگێڕانەوە ، ئەوانیش لە دڵسۆزی‌و وەفاداری بەرامبەر بە سوموزا هیچ شتێکی تریان بە شـیاو نەئەزانی • پشت بەستن بە پاسەوانەکان نەیئـەتوانی سیاســـەتی درێژ خایەن لە ولاتدا سەقامگیر بکات ، پیویست بو ریژیمی سوموزا خـــۆی پایەگــــای سیاسی‌و ئابوری تایبەتی خـــۆی هەبایە ، بۆ ئەمکارەش ئەبوا لیبرالەکانی بە دەستەوە بوایە • سوموزا هەرچون بو ، بە هۆی چـــەند پیـــلان‌و جمو جوڵێکەوە توانی لە لیبرالەکان نزیك بێتەوەو بیانـــکاتە لایەنگری خۆی‌و لە دەزگاکانی دەولەت‌دا کاروباریان پێ بسپێرێ •

ئەوانەی لەگـــەل پێشنیارەکـــەی سوموزادا نەبون لـــە بارەی هەڵبژاردنیانەوە بۆ سەرکۆماری ، یان دور ئەخرانەوە یان ســـەرکوت ئەکران وە یان دەستیان لە کاروباری دەولەتی ئەکێشرایەوە •

سوموزا بۆ ئەوەی ئەپۆزیسیۆنی بۆرجوازی لاواز بکاتو پایەی کۆمەلایەتی خۆی لەناو کۆمەلانی خەلكدا بەهێز بکات روی کردە راپەرینی کرێکارەکانی نیکاراگوا ، بەو مەبەستەی دو بەرەکایەتی لەناو کرێکارەکاندا بخولقێنێ ، یاسایەکی کار کردنی نوێی دانا کە بە پێی زەمینەی کارو گوزەرانی ئەو کاتەی ولاتی ئەمەریکای لاتین یاسایەکی پێشکەوتوانە بو •

به پێی ئەم یاسایە ماوەی ئیشکردن کرا بە هەشت سەعات لە رۆژێکدا ، وە کرێکاران رێگایان پێ درا بە دەستەکۆمەلی داوای مافی خۆیان بکەنو لە گیرو گرفتەکانی ژیانیان بکۆلنەوە •

لەم رێگایەوە توانی یەکێتی زەردی کرێکاران دابمەزرێنێ بیانخاتە ژێر رکێفی دەولەتەوە •• ئەم یاسایە لەو شوێنانەدا جێبەجێ ئەکرا کە ئیشو کاری ئابوری بە دەست ئەو بازرگانو خاوەن سنعەتانەوە بون کە بەربەرەکانێی سوموزایان ئەکردو ئیتر لە شوێنەکانی ترا کاری پێ نەئەکرا •

بەمجۆرە بە هۆی ئەو یەکێتی‌یانەوە توانی پایەگای سیاسی خۆی لەناو هەندێك لە بۆرجوازی‌یەکاندا فراوانتر بکات •

لە سالی ١٩٣٨ دا بە پێی هەلبژاردنێك ئەنجومەنی دامەزرێنەرانی پێك هێناو توانی یاسای بچینەیی بۆ بەهێز کردنی دەسەلاتی خۆی بەکار بێنێ • هەروەها ماوەی سەرکوماری خۆی لە رێگای ئەو ئەنجومەنەوە تا سالی ٩٤٦ درێژە پێ دا • لە سەردەمی دوەمین جەنگی جیهانیدا بە هۆی ئەوەوە کە رێگای بە ولاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکادا بنکەی سەربازی

خۆیان لە وڵاتە کەیا دابنێن بۆ پاراستنی نۆکـەندی «پاناما»و هەروەهـا کەرەسەی خاوی زۆری پێدان •• بەمکارەی بەڵگە یەکی تری وەفاداری خۆی بەرامبەر بە ئیمپریالیزم سەلماند •

بەڵام لە دوای دوەمین شەڕی جیهـانی هـەلو مەرجی لەبار بۆ گۆڕینی باری کۆمەڵایەتی لە ئەمەریکای لاتین هاتە پێشەوە ، راپەڕینی دژی فاشیزم بو بە هۆی گۆڕینی دیموکراتیانە لـە هەندێك وڵاتاندا بـە تایبەتی «گواتیمالا» •• لە نیکاراگواش گێژاوێکی سیاسی توند لـە حاڵەتی خولقاندنا بو ، فراوانبونی ریزەکانی ئەپۆزیسیونو داخوازی خەڵك کـە داوای چارەسەر کردنی دیموکراتیانەیان ئەکرد ، هەڕەشەو گوڕەشـەی خەڵك لـە ریژیمو مانگرتنی سەرتاسەری لـە وڵاتداو زۆر هێنـانی ئەمەرێـکا بۆ پاراستنی یاسای بنچینەیی •• ئەمانە هەمو یەکانگیر بونو ریژیمی سوموزایان ناچار کرد کە لە ساڵی ١٩٤٦ دا هـەڵبژاردن دەست پێ بـکات •• سوموزا ناچار بو خۆی بۆ سەرکۆماری نەپاڵێوێ ، بەڵام لە جیاتی خۆی یەکێك لە دۆستە وەفادارەکانی خۆی کـە ناوی «لیۆناردۆ ئارگویلۆ»(١) بو ، بە هەر فێڵو ساختـە کـارییەك بێت بیـکات بـە سەرکۆمار • بەڵام «ئارگویلو» بە شێوەیەکی چاوەڕێ نەکراو سیاسەتێکی بێ لایەنیانەی گرتە پێش ، هەوڵی دا کە یەکێکی تر لە جیـاتی سوموزا بـکات بە سەرکردەی پاسەوانە گەلییەکان •

سوموزا بەرامبەر بەم کارە زۆر بە گورجی کەوتە خۆ ، هێشتا ٢٧ رۆژ بە سەر هەڵبژاردنەکەدا تێپەڕیبو کە بە رێـگای کودتایەکی هێمنانەوە سەرکۆماری لابردو مامێکی خۆی لـە جیـاتی ئەو کرد بە سەرکۆمار • وڵاتە یەکگرتووەکانیش کە دوچاری شـەڕی سـارد بوبون پشتگیری

(١) Leonardo Arguello.

سوموزایان کــرد • دوای سەرکوتـکردنێکی توندو تیــژی ڕاپەڕینی کرێـکارانو هێزە چەپڕەوەکان ، سوموزا بۆ ئەوەی پایەگای یاسـایی بۆ ڕیژیمەکــەی بەدەست بێنێ سەرلەنوێ لەگــەل باڵە ڕاستەکــەی ئەپۆزیسیۆندا کەوتە گفتوگۆ کردن •

لە ساڵی ۹۵۰ دا گفتوگۆکان سەریان گرت ، کۆنە پارێزەکـانی نیـکاراگوا بەرابەرێتی «ئامیلیانو شامورو» سێ یەکی کورسی پارلمـانو دەزگاکانی تری دەوڵەتیان بەدەست هێنا •• ئازادی زیاتر درا بە کومپانیا بازرگانیەکانو بڕیار لەسەر دامەزراندنی بانقە سەربەخۆکان درا • حزبی کۆنە پارێزان بونە بەهێز ترین باڵی بۆرجوازی نیکاراگواو شەرعیـەتو یاســاو ڕژیمی سوموزاو شوێنو پایــەو هــەڵوێستی ئەپوزیسیۆنـە وەفادارەکانی ســەر بە ڕیژیمیان قبـول کرد • هەروەهــا بۆ ئەوەی سەرلەنوێ سوموزا بە سەر کومار هەڵ بژێردرێتەوە لـە ساڵی ۹۵۱ دا دەسکاری یاسای بنچینەیی کرا •

بەمجـۆرە لــە نیوەی یەکــەمی دەیەی پەنجاکــاندا گۆڕینی ڕیفورمیستانە کرا ، بە هێز ترین باڵی بورجوازی‌یە سەر پێچکارەکان بێ لایەن بون • گەلێك هەوڵو تەقەللای جۆربەجور لە پێناوی لەناوبردنی جوڵانەوەی چەکدارانەو کودتا دراو هەمویان بە ئاسانی تێك شکێنران •

لە ڕوژی ۲۱ی تشرینی‌یەکەمی ۱۹٥٦ دا سوموزا لە کاتێکدا خۆی بۆ هەڵبژاردنی ساڵی ۱۹٥۷ ئامادە ئەکرد لــە لایەن لاوێـکی نیشتمان پەروەرەوە کە ناوی «ریگوبرتو لوپزپرز»(۱) بو کوژرا •• ئەو گێژاوە سیاسی‌یەی کە لە دوای کوشتنی سوموزای یەکــەم رویدا •• بەهۆی

---

(۱) Rigoberto Lopezprez.

نەبونی تاکتیكو ستراتیجی دروستەوە لەناو باڵەکـــانی ئەپوزیسیون‌داو هەروەها پارچە پارچە بونیان ، نەیانتوانی ئـەو گێژاوە بـکەنە گێژاوی شۆڕش • دو کـوڕی سـوموزا ، لویس‌و ئاناستاسیوی دووەم «تاچیتو» بەگورجی کاروباریان گرتە دەست • کوڕەکانی سوموزا هەردوکیان لـە دەرچوانی ئەکادیمی سەربازی ئەمەریکا بون‌و تاقیکردنەوەیەکی زۆریان لە ئیشکردنی سیاسیانەدا هـــەبو «تاچیتو» بو بە سەرکردەی پاســەوانە کەلی‌یەکان ، لویس لە ساڵی ١٩٥٧ دا خۆی کرد بە سـەر کومـار •• ئەم دوانە ڕەووشتێکی توندو تیژیان بەرامبەر بە ڕاپەڕینی کۆمـــەڵانی خەڵك گرتە پێش ، لە ماوەی چەند مانگێکدا زیاتر لە دوازدە هــەزار کەس دەسگیر کراو لـــە مـــاوەی سێ ساڵیشدا چـــەندان ڕاپەڕینی چەکدارانەی کۆمەڵانی خەڵکیان تێکشکاند •• لـە سەردەمی حکومەتی لویس سوموزادا زیاتر لە ٨٠٪ی حکومەتەکەی سەربازی بو •

لە ساڵی ١٩٦٠ دا لویس سوموزا لە ئەنجامی ئاژاوەو پاڵەپەستۆی ناوخویی ناچار بو بەرنامەی لیبرالیزاسیونی کوتایی ســەردەمی باوکی سەر لەنوێ دابنێتەوە و لەگــەل کۆنە پارێزەکاندا کـــەوتە گفتوگۆ کردنەوە • بەڵێنی دا هەڵبژاردنێکی شەرافەتمەندانە دەست پێ بکات ، لە یەکجار زیاتر خۆی بۆ سەرکۆماری نەپاڵێوێ ، بەڵام کۆنە پارێزەکـــان داوای زامــــن کـــردنی پێداویستی‌یە دەستەبەری‌یەکـــانی ئـازادی دیموکراتی‌یان ئەکرد • ئـەم داخوازی‌یانە وەر نەگیران لە ئەنجـامدا کۆنەپارێزەکان بەشداری هەڵبژاردنی ساڵی ١٩٦٣ یان نەکرد •

لویس سوموزا بەرامبـەر بە پاڵـە پەستۆی [یەکێتی بۆ پێشکەوتن] بەشداری هەڵبژاردنی نەکرد ، بەڵام دۆستێکی پەروەردەی دەستی خۆی

که ناوی «رنەشیك»(۱) بو ، بۆ سەر کوماری دیاری کرد • ئەم پاڵێوراوە لـە ژێر سەرنجی توندو تیژی پاسەوانی گەلیدا بو بە سەرکۆمار • لـە هەمو سەردەمی سەرکۆماری «شیك» دا [٦٣ ـ ١٩٦٧] دەسەلاتی هەرە گەورە بە دەست بنەماڵەی سوموزاوە بو ، بە تایبەتی «ئاناستاسیو سوموزا» [تاچیتو] کە وەکو سەرۆکی پاسەوانەکان بو چاوێری هەمو نەخشەیەکی سیاسیانەشی ئەکرد •

لـــە سەردەمی رنەشیك دا سیاسەتی دامـــەزراندنی رێکخراوە کرێـکاری‌یەکان بەکـار ئەهێنرا ، گـــەلێك رێکخراوی کارگوزاری‌و کۆمەلایەتی‌و پیشەیی‌و یەکێتی کرێـکاران پێك هاتن کە هەمویان ســەر بە لیبرالەکان بون • گەشە کردنی راپەڕینی چەکدارانە ریژیمی ناچار کرد کە پایەگای سیاسی تازە دابمەزرێنێ ، یارمەتیەکانی ئەمەریـکا لـــە چوار چێوەی [یەکێتی بۆ پێشکەوتن]و بەرنامە ناوچەییەکانی تر مـاوەی زۆریان بۆ گەشە کردنی بەشەکانی دەوڵەت‌و بەهێز کردنی بۆرجوازی بۆرۆکرات فراوان کرد •• ئامانجی شیك ئەوە بو کە دەزگای دەوڵەت لەناو جوغزی خزمەتکردن بە بۆرجوازی بۆرۆکرات‌و بنەماڵەی سوموزا رزگار بکات‌و بیکاتە دەوڵەتی تەواوی چینی بۆرجوازی گرێدراو •• بە بیروڕای ئەو ، ئەمجۆرە دەوڵەتە ئەتوانێ لـە بەردەم شالاوی راپەڕینی شۆرشگێڕانەدا خۆی رابگرێ •

بەرنامەکانی شیك ، کە تا رادەیەك لویس سوموزای ئەپاراست ، بەلام لەگەل ئاناستاسیو سوموزادا کەوتە ناکوکی‌یەوە ، ناکۆکی نێـوان ئەم دو برایە گـــەلێك لایەنی فراوانی لێ بۆو وە•• ئاناستاسیو پشتی بە خەڵك نەئەبەست لەو باوەڕەدا بوو کە ئەبێت دەسەلاتی سیاسی هـەر بە

(۱) Rene Scick.

دەست بنەماڵەی خۆیانەوە بێت • پاسەوانە گەلی‌یەکانیش رۆڵێکی گەورە لەم بوارەدا بگێڕن ، لە ساڵی ٩٦٥ دا کەوتە سەر کوتکردنی ئەوانەی لە حزبی لیبرالدا سەرپێچی یان‌ئەکرد ، بۆ ئەوەی دەسەڵاتی تەواو بگرێتە دەست خۆی •• لە ساڵی ١٩٦٧ دا بە شێوەی رەسمی وەکو سەر کۆمار ئەمو دەسەڵاتێکی گرتە دەست خۆی •

سوموزا دوای ئەوەی دەسەڵاتی گرتە دەست کەوتە شوێن سیاسەتەکەی باوکی • گەلێك کاروباری گرنگی بە ئەندامانی پاسەوانە گەلی‌یەکان سپارد ، دەوڵەتو خەڵکە بوروکراسی‌یەکان وەکو زایندەی پاسەوانەکانیان لێ هات ، مردنی لویس سوموزا چەند هەفتەیەك دوای هەڵبژاردنی تاچیتو بۆ سەر کۆماری لە ناکاو دڵی وەستاو ئەم روداوە رێگای بۆ دەسەو دایەرەی تاچیتو خستە سەر گازی پشت •• سود وەرگرتنی ئاشکرا لە دەسەڵات ، خۆ دەوڵەمەند کردن بە هۆی دەسەڵاتەوە ، کرداری نا شەرعی‌و نا قانونیانەی دەوڵەت ، بە هیچ سەیر کردنی کۆمەڵانی خەڵك‌و بۆرجوازی یەکان ، ئەمانە بونە هۆی ئەوە ریزی سەرپێچی کاران‌و رەخنە گران بەرینتر بێت‌و تاچیتوش زیاد لە جاران خزایە ناو باوەشی ئەمەریکاوە •

ناکۆکی‌و سەرپێچی لەناو ریزەکانی پاسەوانە گەلی‌یە کاندا پەیدا بو ، بەرز کردنەوەی پلەی «خوزە سوموزا» برای «ناتنی تاچیتو» ئەفسەرەکانی پاسەوانانی گەلی زۆر تورە کرد ، قاچاخچێتی کردنی هەندێك لە پاسەوانەکان بو بە هۆی ئاژاوە نانەوەو لێکدان لە نێوان ئەفسەرە پاسەوانیەکاندا •• وەڵامدانەوەی سوموزا لەو مەسەلانەدا بو بە هۆی سەرکوتکردنی توندو تیژی سەربازە سەرپێچی کارەکان‌و پێك هێنانی ئەڵقەیەکی ناوخۆیی لە ناو لەشکرو خەڵکە وەفادارەکاندا •

لەگەل فراوانبونی ریزی سەرپێچی گاراندا ، دو کارەساتی تر لە سالی ۱۹۷۲ دا بونە هۆی لاواز کردنی دەسەلاتی سوموزا •

**یەکەم :** هەرزان بونی نرخی قاوەو لۆکە لە بازاڕی جیهانیدا کە بو بە هۆی جۆرە گێژاوێکی ئابوریو ژەنگاوی کردنی کاروباری دارایی دەولەت •

**دووەم :** بومەلەرزە سەختەکەی ۲۳ی ئەیلولی سالی ۱۹۷۲ کە بەشێکی زۆری شاری «ماناگوا»ی پایتەختی وێران کرد •

ئەو یارمەتییە داراییانەی لە دەرەوە ئەهاتن بۆ ئەوانەی لە بومەلەرزەکەدا زیانیان لێ کەوتبوو هەموی ئەدرا بە بنەمالەی سوموزاو پاسەوانو سەربازەکان بۆ ئەوەی ئیمپەراتوری مالی سوموزای پێ بەهێز تر بکەن • بۆرجوازییە کانی نیکاراگوا پەیوەندی خۆیان بە بچڕاوی ئەبینی لەگەل بنەمالەی سوموزادا ، بەرە بەرە چونە ناو راپەڕینی تازەوە •

لە سالی ۱۹۷٤ دا گێژاوی جیهانی ئیمپریالیزم لە نیکاراگوا لەسەر لایەنە رەخنە گرەکانی خەلك لە لایەکەوەو ئەپۆزیسیۆنە بۆرجوازییەکان لە لایەکی ترەوە زیادی کرد بە جۆرێك کە گێژاوی ئیستای نیکاراگوا بە ماکی ئەو گێژاوە دائەنرێت •

## ٤ـ ئیمپەراتوری ئابوری

کاتێك سوموزای یەکەم لە سەرەتای سیەکاندا دەسەلاتی گرتە دەست ، هەمو ساماتێکی تەنیا کێلگەیەکی بچوكو پارچە زەوییەکی

نۆکه بو ، کاتێك له ساڵی ١٩٥٦ دا کوژرا سامانه‌کەی له نێوان ٦٠ـ١٥٠ ملیۆن دولار بو که دەیه‌کی هەمو زەوی‌و زاره کشتوکاڵی‌یه‌کانی وڵات ، ٥١٪ی کێڵگه‌کانی قاوه ، چـــەندان بەشی کومپانیا بازرگانی‌یه‌کـانو چەندان ئەپارتمانو خـانوو بەرەو زەوی‌و زاری شاری «ماناگوا»ی بـه دەستەوه بوو •

سامانی بنەماڵەی سوموزا له دوایدا زور تر بو ، ئەمرۆکه تەنیا له ناوخۆی نیکاراگوادا ئەگاته نزیکەی ٤٠٠ ـ ٥٠٠ ملیۆن دۆلار ، کـه شەش یه‌کێکی هـەمو وڵاتی نیکاراگوا ٣٠ ـ ٢٥٪ هـەمو ئەو زەوی‌و زارانـەی بۆ کشتوکـاڵ دەست ئەدەنو ٢٦ کومپانیـای گـــەورەی بازرگانی‌و ••• ئەمانه هەمو بەشێکن له سامانو دارایی سوموزا ••

له سەرەتای چله‌کاندا بانقه‌کانو هەمو ئاژانسه دەوڵەتی‌یه‌کانی لـه پێناوی زۆر بونی سامانی خۆیدا به‌کار ئەهێنا • وەکو دەسگرتن بەسـەر بەروبومو کڕینو فرۆشتنو رێـگادان بۆ هێنانی کەلوپەلو دانانی نرخی شتومەك بـــه قازانجی خۆی‌و ئەمجۆره شتانەدا • هـەمو ئیعتیباراتێـکی دەوڵەتی ـ سەنەدو باوەڕ پێکردن ـ ی له پێناوی قازانجی کومپانیاکانی خۆیدا ئەخسته کارو ئیتر هەمو خەڵکی وڵات لێ‌ی بێبەش بون •

به درێژایی دوەمین شەڕی جیهانی سوموزا قازانجێکی زۆری لـه فرۆشتنی کەرەسەی خاو وەکو [زێڕ ، تەخته ، شتی تر ] •• به وڵاتـه یه‌کگرتوه‌کانی ئەمەریکاو ، هەروەها دانانی قومار خانەو تیاترۆ خـانەو بەرهەم هێنانی خواردنەوەو قاچاخچێتی کەرەســـەی گێژ کەر [ کـــه سەربازه ئەمەریکایه‌کان به شوێنیدا ئەگەڕان ] ، دەسکەوت • گـەلێك سودی له رۆژگاری شـــەڕ وەر گرت ، هەمو کێڵگه‌کانی قاوەو مڵکو ماڵو کەلوپەلی ئەڵەمانیه‌کانی داگیر کرد •

له دوای دوەمین شەڕی جیهانی سوموزا چەندان تاکتیکی تازەی بۆ کۆ کردنەوەی سامان بەکار هێنا ، پاسەوانە گەلی‌یەکانی ئەکرد بەگژ ئەو کەسانەدا کـــە زەوی‌و زاریان هەبو بۆ ئەوەی بە هـــەرزان پێ‌ی بفرۆشن ، هەرکـــەس ســەرپێچی کردبایە ئەیانــکوشت یان زیندانی ئەکرا ٠٠ ملك‌و ماڵی هەمو ئەو کەسانەی بە بێ بیانو داگیر ئەکرد کـــە سەرپێچی‌یان لە هەڵوێست‌و فەرمانەکانی ئەکرد ، وەکو کارگە زێڕەکانی «سان ئەلینو» کە هینی لایەنگرانی چەکدارە ساندینیستەکان بو ، هەموی داگیر کردن ٠

دوای ئەوە بنەماڵەی سوموزا چەندان کارگەو دەزگای مودیرنی سنعەتی دامەزران‌و چـــالاکی ئابوری یان زیادی کـــرد ٠ هـــەروەها مەڵبەندە کانی خراپە خوی‌ی‌و [ بەد رەووشتی ] قومار خانەو ئەمجۆرەشتا نەیان بەسەرکردە گەورەکانی پاسەوانەکان سپارد ٠ لەجیـــاتی ئەمـــانە رێـگای کـــەشتی رانی‌و کومپانیای هاتوچـــۆی ئاسمانی‌و بارکردن‌و گواستنەوە بوو بە ملکی تایبەتی سوموزا ٠

لەگەل ئەوەشدا سوموزا دەستی لەچاودێری کردنی قاچاخچیەکـانی کەرەسەی گێژ کەرانە هـەڵنەگرت [کەسودێـــکی زۆری تیـــا بو ] ٠٠ قاچاخچی‌یەکی گەورەی تلیاك فرۆشی‌لە ســـاڵی ١٩٧٤ دا لەیەکێك لەدادگاکانی ئەمەریکا پەردەی لەسەر مامەڵەو مامـەڵە کاری خۆی لەگـەل سوموزا هەڵماڵی‌و لەبواری نێـۆ دەوڵەتاندا ریسوای کرد ٠

لە حەفتاکاندا سوموزا بازرگانی یەکی پڕسودی تازەی دۆزیەوە

ئەویش بەهاریکاری کوبایە راکردوە کان بانقێکی خوێنی دامەزراند •
ئەم بانقە بەپارەیەکی کەم خوێنی لەخەڵکی نیکاراگوا ئەکڕیو ئەینارد
بۆ ئەمەریکا و ئەوروپا •

هەندێك دەزگاو دامەزراوی تر کە بونە ملکی تایبەتی بنەماڵەی
سوموزا دەزگا کانی رادیۆو تەلەفزیۆنو رۆژنامەو ماسی گرتنو کارخانە
کانی بەرهەم هێنانی خۆراكو گوشت کردنە قوتوو پالاوتگەی نەو تەو
کەرەسەی خانووبەرەو رستنو چنینو ئەمجۆرە شتانە بون • لەکۆتایی
حەفتا کاندا دەسمایەی لەدەزگاو دامەزرا وەکانا خستەکار ، چەندان
بانقی تازە دا مەزرانو چەندان کومپانی تر بونە ملکی ئەو بنەماڵەیە ••
بەمجۆرە بنەماڵەی سوموزا بریتی بو لە کۆمەڵێکی تەواوی دارایی کە لە
زوربەی دەزگا ئابوری یەکانی ولاتی نیکاراگوا دا چالاکی ئابوری
یانەیان ئەنواندو زوربەشیان بە تەواوی بەدەست خۆیانەوە بون •

ئەمرۆ کە جگە لەسەدان ملیۆن دولار سامان لە نیکاراگوا کە
بەدەست ئەم بنەماڵەوەیە ، ئیمپەراتوری ئابوری سوموزا لە هەمو ولاتانی
ئەمەریکادا بلاوبۆتەوە • ئەگەر چی ژمارەی سەرمایەی سوموزا لەولاتە
کانی دەرەوەی نیکاراگوا دا نهێنیو شاریاوەیە بەلام وەکو ئەلێن
بەشێکی زۆری کومپانیای پۆلای ئەمەریکا ، یان ئەمریکان ، ئوتیلە کانی
ئینتەر کنتیناتتال و بەشێکی زۆر زەوی و زارو ئەپارتمانە کانی
کالیفۆرنیای خواروو فلۆریدا هینی سوموزا یە ••

**سوموزا چۆن توانیوێتی ئەو سامانە بەدەست بێنێ و**
**ئیمپە راتۆری ئابوری لە ئەمەریکای لاتین دا پێك**
**بێنێ ؟**

ئاناستاسیو سوموزا ئیستاکە هەمو پایەو پلە گرنـگە کانی دەوڵەتی بەدەست خۆی‌و بنەماڵە کەیانەوە داوە • جگە لەسەرەکایەتی کۆمـــار ، سەرۆکایەتی پاسەوانی گـەلی ، سەرۆکایەتی کۆمیتەی دارایی دەرەوە ، سەرۆکایەتی کۆمیتەی ناتاسایی گـەلی‌و چـەندان پایەوپلەی گرنگی‌تری دەوڵەتی بەدەست خۆیەوە گرتوە • لەکاتی بومەلەرزەکەی ساڵی ۱۹۷۲ دا ســـەرۆکی کاروباری پیتاك کۆکردنەوە بو • بەشێکی زۆری لـــەو یارمەتی‌یە ۲۵۰ ملیۆن دۆلاری‌یەی کەلەدەرەوە درابو بە نیکاراگوا بۆ زیان لێکەوتوە کانی بومەلەرزە کە گرتیە ژێردەستی خۆی • کومپانیـا بازرگانی یەکانی سوموزا هیچ جۆرە باج و گومرکێکیان لەسەر نەبو ، تە نانەت زوربەیان ئاوو کارەبای خۆڕاییان هـــەبو • بــە شێکی تری کومپانیا گرنگەکانی نیکاراگوا ناچار بون هــەندێك لەبەشەکانی خـۆیان بدەن بەئەندامانی بنـەماڵەی سوموزا ، بێ ئـەوەی هیچ پوڵ و پارەیەك لەبەرامبەریا وەربگرن •

بەو جۆرە لەماوەی ٤٢ ساڵی رابوردودا(۱) ، بنەماڵەی سوموزا بو بووە بەشێـکی هەرگیزکەرت نەبووی بۆرجوازی نیکاراگوا ، شـایانی باسـکردنە پاشەکەوتەی سامـــانی بنەماڵەی سوموزا بەشێکی گرنـگی کاپیتالیستانەی نیکاراگوا یە ٥٠دەسەو دایەرەی دارایی سوموزا بەشێك بو لە زنجیرەی بەیەکەوە بەستراوی دەستەو کۆمـــەڵە ئابوری یەکـــان کەدەسەلاتی خۆی لـــە رێـگای دانانی وردە کاری یانەو چـــاودێری کومـــەڵە ئابوری یەکـــانی وەکو «بانیك»(۲) و «بانامریـکا»(۳) بەدەست هێنا بو •

(۱) مەبەست لە سەردەمی نوسینی کتێبەکەیە ٠٠ نەك ئیستا ـ **وەرگێر** •

(۲) Bance Nicaraquense - BANIC.

(۳) Bancode America - BANAMERICA.

بەلاماربردنی دەستەی سوموزا بۆ سەرقازانجی ئـەو دوکۆمـەڵە بوبەهۆی چەندان پێکادانی گرنگ کەزوربەیان بەقازانجی سوموزا تەواو ئەبون • ئەم سێ کومـــەڵە لەزۆر بواری ئابوری دا ، دانانی سەرمایەو خستنە کاری دەسمایەدا هاوبەش بون • بەرنامە فراوانە ئابوری یەکانی سوموزا سودی بە هەمو بەشەکانی بورجوازی گەیاندوەو هەمویان پێ‌ی قایل بون • لەشەستەکانا هەمو بۆر جوازی یەکـانی نیکاراگوا پشتگیری پرۆژەی سنعەتی کردنیان ئەکرد کە لە لایەن ریژیمی سوموزا وەئەکرا •

سیاسەتی دارایی سوموزاو کەمکردنەوەی نرخی ئاوو کارەبا نەك تەنیا بە قازانجی سوموزا بو بەڵـــکو هەمو بەشەکـانی تری بۆرجوازی سودیان لێ وەرئەگرت ، بەو جۆرە سوموزا بوبو بە نوێنـەری قازانجی هەموو بەشە بۆرجوازی‌یە گرێدراوەکان ، ئەمەش هـۆی ئەوەبو کــە سوموزا بەبێ پشتگیری کردنی بۆرجوازی یەکـانی تر نـەی ئەتوانی لەوماوە دورودرێژە دا درێژە بەدەسەلاتی حوکمداریتی خۆی بدات • • بونی دەسەلاتی سیاسی بەدەست سوموزاوە زامنی‌بارا ستن‌و سەقامگیر بونی ریژیمی بورجوازی ئەکرد •

## راپەڕینی شۆرشگیرانەی نیکاراگوا :

یەکەمین تێکشکانی راپەڕینی ئازادیخوازانەی خەڵکی نیکاراگوا لە ساڵی ١٩٣٤ دا رۆژگارێکی نوشوستی سیاسی درێژی بە شوێن خۆیدا هێنا ، کە راپەڕینی شۆرشگێڕانە وەکو هەڵچونێکی سیاسی ئاڵۆزی لێ هاتو سەرکردەکانی لەناو چون • رۆژگاری شەڕی دژی ئیمپریالیزم ٢٧ – ١٩٣٤ گەلێك تاقیکردنەوەی گرنگی نیشانی خەڵك دا ، بەڵام ئەم تاقیکردنەوانە تەنیا لە دوای سەرلەنوێ تازە کردنەوەی راپەڕینی شۆرشگێڕانە کەوتە بەرچاو کە لە کۆتایی پەنجاکاندا رویدا •

راپەڕینە ئازادیخوازەکانی ساڵانی ٢٧ – ١٩٣٤ ناوەڕۆکێکی قوڵو روناکی دژی ئیمپریالیستی هەبو ، ئەم ناوەڕۆکە شۆرشگێڕانەیە لەگەڵ ستراتیجی شۆرشگێڕانەی چەکداری‌دا شەقڵی روخسارێکی راستی راپەڕینی دژ بە ئیمپریالیزمی دەست درێژکار دەرکەوت ، پێشەنگەکانی راپەڕین بە سەرکردەیی ساندینو لە دوای کۆتایی شەڕ لە پێناوی یاسای بنچینەیدا لە ساڵی ١٩٢٧ راپەڕینیان پێك هێناو

راپەڕینی چەکدارانەیان بە تەنیا ڕێگای چارە سەریانەی هەمو مەسەلە سیاسیو ئابوریو کومەڵایەتیە کانی خەڵکی نیکاراگوا ئەزانی ٠

لە ماوەی ئەو حەوت ساڵەدا گەورە ترین ڕاپەڕینی خەڵکی ئەمەریکای لاتین رویدا ٠ شەڕی نارپێكو پارتیزانی یانە لەگەڵ راپەڕینەکانی تری سەرجەمی خەڵکدا توانی دابو دەزگای سەربازی وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا تێك بشکێنیو ئیمپریالیزمی دەست درێژکار ناچار بکات کە وڵاتەکە بەجێ بێلێ ٠٠٠

لەگەڵ دەرکردنی دەست درێژ کارانی ئەمەریکاییدا شەڕو ناکۆکی توندو تیژ لەگەڵ کۆنە پەرستانی ناو خۆدا دەستی پێکرد ، شێوەی راپەڕینەکە لە شێوەی چەکداری‌یەوە گۆڕدرا بۆ شێوەی سیاسی ٠٠ بەڵام پیلانی کوشتنی ساندینۆ لە ساڵی ١٩٣٤ وپەلاماری کتوپڕیو لەناکاو بۆسەر بنکەو پایەگاکانی چەکدارە راپەڕیوەکان بوو بە هۆی ئەوە کە راپەڕینەکە تێك بشکێ ٠٠ لە ماوەی سێ ساڵ شەڕی سەرکوتکەرانەدا جەنڕال « پدرو ئالتا میرانو » لە ناو چوو دوا قەڵای شۆڕشگێڕەکان لەناو براو راپەڕیوەکانی ساندینیستا ناچار بون وڵاتەکە بەجێ بهێڵن ٠

لە دوای تێکشکانی راپەڕینی ساندینیستا سەر لەنوێ راپەڕینی شۆڕشگێڕانە دەستی پێکردەوە کە تاکو ساڵی ١٩٥٦ درێژەی کێشا٠٠ ئەم نوشوستی‌یە دورو درێژە پەیوەندی بە بەرەی ئازادیخوازی گەلی ساندینیستاوە هەبو ٠

نوشوستی راپەڕینی شورشگێڕانە مانای کۆتایی هێنان بە راپەڕینی خەڵکی نیکاراگوا نەبو، لە گەڵ ئەوەشدا کە عونسورەکانی راپەڕینە کە لاواز بون بەڵام کۆتایی هەر پێ نەهات ٠

بۆ نمونە لە سەرەتای مانگی مایسی ١٩٣٥ دا چەندان خۆ نیشاندانی بەربڵاو لە لایەن کرێکارانی دەزگا سنعەتی‌یەکانەوە دەست پێکرا کە بە لایەن پاسەوانە گەلی‌یە کانەوە سەرکوت کران .. ساڵی دوای ئەوە کاتێك نرخی نەوت زیادی کرد مانگرتنێکی گەورەی کۆمەڵانی خەڵك دەستی پێکرد . لە ساڵەکانی دوایشدا دیسان راپەڕینی مانگرتنانە لە چەند شوێنێکی تایبەتیدا رویدا . لە ساڵی ١٩٤٤ دا کرێکارانی کومپانیای لاستیك دروست کردن لە کارگەی [ لائایندیا ]و [ مرالاد لوس بواس ] راپەڕینێکی فراوانیان رێکخست ، کە تەنانەت گەیشتە رادەی پەلامار دانی چەکدارانە .. دیسانەوە لە ساڵەکانی دوایی تردا مانگرتنی کرێکارە کشتوکاڵی‌یەکان لە کێڵگەی «چی چی گالپا»و راپەڕینی جوتیارەکان لە « بواکو » لە دژی خاوەن زەوی‌و زارەکان دەستی پێکرد .

ئەتوانین گەورە ترین تایبەتەکانی سەردەمی نوشوستی ٢٢ ساڵە بە نەبونی رێکخراوێکی شۆرشگێرانەی پێشڕەو لە باڵی چەپداو ، سەرکوتکردنی یەك لە دوای یەکی راپەڕینەکان ، بە تێکشکانی راپەڕین‌و دەسەڵاتی بۆرجوازی‌یە راستڕەوەکان دابنێین .

## ١ـ خۆ رێکخستنی راپەڕینی نوێی شۆرشگێرانە

لە سەرەتاو کۆتایی پەنجاکاندا چەندان هەل‌و مەرجی تازە پەیدا بون . لە دوای دوەمین شەڕی جیهانی کۆتایی بە سەردەمی « رەونەق » هات‌و ئیمپریالیزمی جیهانی دوچاری گەلێك ناکۆکی و ئاڵۆزی ئابوری‌و سیاسی هات .. لە نیوەی یەکەمی پەنجاکاندا ریژیمی نیکاراگوا توانی بەهۆی سود وەرگرتن لە گرانی نرخی لۆکە مەوقیعەتی خۆی بسەلمێنێ

گرانی نرخی لۆکه بو به هۆی ئەوه که خاوەن زەوی‌و زارەکانی ڕۆژ ئاوای وڵات جوتیارەکان به زۆر له سەر زەوی‌و زارەکانیان دەر بکەن ، ئەو بەشه جوتیارەی که به شێوەی کرێکاری ڕۆژانه لـــه کێڵگەکان ئیشیان ئەکرد دوچاری هەژاری‌و دەسکورتی بون‌و ئەمـــه خۆی لـــه خـــۆیدا زەمینەیەکی لـەباری بۆ ڕاپـەڕینی شۆڕشگێڕانەی خەڵـکی نیکاراگوا ڕەخساند •

له ساڵی **١٩٥٦** دا دیکتاتۆری نیکاراگوا به هـۆی کۆمەڵێکی بچوکی شۆڕشگێڕانەوه بەســەر کردەیی « ریگۆ برتۆ لوپزپرز » ئیعـــدامی شورشگێڕانه کراو دوای ئەوه گێژاوی سیاسی سەرتاسەری نیکاراگوای گرتەوه ، له دوای ئەم کارەش سەردەمی نوشوستی سیاسی کۆتایی پێ هات‌و هـــەل‌و مـەرجی لەبار بـۆ ســـەرلـەنوێ هەڵـــگیرساندنەوەی ڕاپەڕینـــی ئازادیخوازانەی خەڵـکی نیکاراگوا هـــاته پێشەوەو دوەمین قوناغی ڕاپەڕینەکه ئاماده بو •

گێژاوی ئابوری که به هۆی هەرزان بونی نرخی لۆکەو قـاوەوه بو ، له نیکاراگوا دەستی پێکردو ئەم کاره بو بـه هـۆی گەشـــه کردنی ڕاپەڕینی کۆمەڵانی خەڵـکی نیـکاراگوا • کرێـکارانی ڕێـگای ئاسن ، کەوش دروەکان‌و نەخۆشخانەکـــان‌و کرێکاره کشتوکـاڵی‌یه کـــان‌و جوتیارەکان لەگەل مامۆستاو قوتابیاندا کەوتنه خۆ • ڕاپەڕینی نەقـــابەی کرێـکاران پەرەی سەند زیاتر له **١٨** یەکێتی کرێکاران دامەزران •

ڕاپەڕینی قوتابیانی نیکاراگوا له **٢٣**ی مانگی تەموزی **١٩٥٦** دا ئاڵای

ڕاپەڕینیان لە دژی ڕیژیمی کۆنە پەرستانەی سوموزا بەرز کردەوە ، لەو سالەدا دەستەیەکی بچوك لە دانشگای نیکاراگوا وەکو ڕێکخراوێك دامەزران •• ڕاپەڕینی قوتابیان جگە لە ڕابەرایەتی کردنی قوتابیەکان دەستیان کرد بە ڕێکخستنو هێنانە ناو کێشەی ڕاپەڕینی کرێکارانو جوتیارانەوە •

لە ساڵی ١٩٥٩ دا خەڵکی شاری «لیۆن» خۆ نیشاندانێکی بێ دەنگی یان لە سەر شەقامەکان ساز کرد بۆ دەربڕینی بێزرای یان بەرامبەر بە تاوانەکانی ڕێژیمی سوموزا •• بەڵام ئەو خۆنیشاندانە بە شێوەیەکی زۆر بێ وێنە لە مێژودا خوێناوی بو کە زوربەی خەڵکی شارەکە بە دەست پاسەوانە گەلی یەکان کوژران •

لە هەمان کاتا سەرکردە چەپی یەکانی ڕاپەڕینی قوتابیان هەوڵیان دا ڕێکخراوێك بە ناوی [بەرەی لاوە شۆرشگێرە گەلی یەکان]ەوە دامەزرێنن چونکە بە دەست زەبرو زەنگی هێزە کۆنەپەرستەکانی سوموزاوە دوچاری شکستی هاتبون • زوربەی ڕاپەڕینی قوتابیان دروشمی « نە چەپو نە ڕاست » یان بەرز کردبۆوە چونکە بیرو باوەڕی چینی فەرمانڕەوا زۆر کاری تێ کردبون •

لەو سەردەمەدا چەندان کودتاو یاخی بونی چەکدارانەی جۆربەجۆر لە لایەن کۆنە پارێزەکانەوە ساز ئەدرا کە زوربەیان لە لایەن وڵاتە دراوسێکانیانەوە پشتگیری یان لێ ئەکران • ئەمجۆرە هەوڵدانانە بە هیچ جۆر شۆرشگێرانە نەبون چونکە مەبەستیان لەناو بردنی ڕیژیم نەبو بەڵکو تەنیا ئەیانویست چەند ئیمتیازاتیکیان دەست بکەوێت ، هەروەها لە ناو هوردوگا سەربازی یەکانیشدا چەندان جار یاخی بونی چەکداری ڕوی ئەدا کە هەمویان بە توندی سەرکوت ئەکرانەوە •

هەمو ئەو چالاکی‌یانەی کە لە نێوان ساڵەکانی ٥٦ ـ ١٩٦٠ دا روی ئەدا ئەوەی نیشان ئەدا کە قۆناغێکی تازە بۆ راپەڕینی شۆرشگێڕانە لـــە کۆمەڵدا پەیدا بووە • ئەتوانین دیاردە تایبەتیەکانی ئەم سەردەمە بە شێوەی خوارەوە بخەینە بەر چاو •

١ ـ گێژاوی ئابوری بــە هۆی کەمبونەوەی نرخی لۆکـــەو قاوە لـــە بازاڕی جیهانیداو زۆری بێکاری لەناو کرێـکارە کشتوکاڵکارەکاناو گەشە کردنی بیزاری‌و توڕەیی •

٢ ـ کەمــکردنەوەی توندو تیـــژی دیکتاتۆریانە لـــە دوای کوشتنی سوموزای یەکەم لە لایەن نیشتمان پەروەرەکانەوەو هاتنە پیشەوەی زەمینەی لەبارو فراوان بۆ راپەڕین‌و گەشە کردنی راپەڕینەکان •

٣ ـ گەشە کردنی راپەڕینی خۆ بە خۆیی لەناو توێژەکانی خەڵــکدا ، کرێکاران ، جوتیاران ، قوتابیان ، بۆرجوازی بچوکی شارەکــان‌و سەربازەکان ئەویش بە هۆی روداني دو خاڵەکەی سەرەوە •

٤ ـ ئارەزوی خـــەڵك لـــەناو هێـــزە هوشیارەکانا بۆ رێکخستن‌و دامەزراندنی دەستەو کۆمەڵی شۆرشگێڕانەی بەربڵاو •

٥ ـ نەبونی رێکخراوێکی شۆرشگێڕانەی ئەوتۆ کە بتوانێت لـــە پێش راپەڕینی خەڵکەکەوە راپەڕینی دژی ریژیم ساز بدات ، هەروەهـا ئەوەش کە حزبی سوشیالیستی نیکاراگوا کەمتوانایی خۆی لـــە بارەی رابەرایەتی کردنی شۆڕشگێڕانەی کۆمـــەڵانی خەڵـــکەوە دەرخستبو ، وە بە زۆری شوێنی کۆمەڵانی خەڵك ئەکـــەوتن •• هەروەها حزبە بۆرجوازی‌یەکـان ماوەیەکی زۆر بو کـــە پەیامی مێژویی خۆیان دۆڕاندبو •

٦ – بە شێوەی گشتی لاوەکان ئارەزویان لە راپەڕینی شۆڕشگێڕانە بو ، بە تایبەتی لە دوای سەرکەوتنی شۆڕشی کوبا •

٧ – تێکشکانی هەوڵو تەقەللای سەربازی‌یانە کە بە زۆری وەکو پیلان یان پەلامار لە لایەن ولآتە دراوسێکانەوە رێك ئەخرا ، لەگەل ئەوەشدا ئەمجۆرە کردارانە لاوە شۆڕشگێڕەکانی خستە سەر بەزمو بساتی رێبازی چەکدارانە •

٨ – یەکگرتنی بەشەکانی رێکخراوی سیاسی‌و سەربازی پێشڕەو •

## ٢ـ پێك هاتنی بەرەی ئازادیخوازی گەلی ساندینیستا

لە ٢٣ی تەموزی ١٩٦١ دا « بەرەی ئازادیخوازی گەلی ساندینیستا پێك هات ، دامەزراندنی ئەم بەرەیە گەورەترین روداوی مێژویی سەردەمی تازەی مێژوی نیکاراگوا بو ، ئەم بەرەیە ناوی خۆی بە ناوی «ساندینو»ی رابەری راپەڕینی دژی ئیمپریالیستی ساڵەکانی ٢٧–١٩٣٤ەوە ناو نابو ، زور بە گورجی‌و لە ماوەیەکی کەمدا توانی خۆی وەکو گەورە ترین روداوی راپەڕینانەی نیکاراگوا بسەلمێنێ •

بەرەی ساندینیستا راستەوخۆ لەناو دەرونی نوشوستی‌یەکانی رابوردوی راپەڕینەکانی خەڵکی نیکاراگواوە سەری هەڵدا ، ئەو نوشوستی‌یانەی کە لە لایەن ئەپۆزیسیۆنی بۆرجوازی‌و حزبی سۆشیالیستی نیکاراگواوە کەوتبونەوە • هاتنە کایەی بەرەی ناوبراو وەکو کۆتایی یەکەمین قۆناغی چالاکی چەکدارانەو سەرەتای قۆناغێکی تازەی شۆڕشگێڕانەی خاوەن ئۆرگانی سیاسی – سەربازی یەکپارچەو شۆڕشگێڕی تایبەتی دەرکەوت • چالاکی چەکدارانەی ساڵەکانی

٥٦ ـ ١٩٦١ هیــچ بەرنامەیەکی تیــوری شۆرشگێرانەو رێــکخستنی ناوەندیو رێبازێکی ئایدیۆلۆجیکیو پایەو پلەی لەناو کۆمەڵانی خەڵــکدا نـــەبو •

ئـــەم کەمو کورتیانە لـــە ئەنجامی نەبونی ئازادی دیموکراتیو نزمی ئاستی رۆشنبیرانەی خەڵكو نەبونی ئایدیۆلۆجیو تیوری شۆرشگێرانەوە خولقابون •

بەرەی ئازادیخوازی گەلی ساندینیستا ئەبوا هــەلو مــەرجی تازەی دەرونی لەبارەی راپەرینی دژی ریژیمی سوموزاو لەناو بردنی قەوارەی ئابوریو سەربازی بوروکراتیــکی فەرمانرەواوە دابنایە •• ستراتیجی بەرەی ئازادیخوازی گەلی ••• بریتی بو لــە شەری پارتیزانیانە ، کـــە شێوەیەکە لە شێوەکانی راپەرینی چەکدارانەو سود لە دەستەو کۆمەڵــە بچوکەکانی ناوچە لادێیەکان وەر ئەگرێو کۆمەڵانی خەڵك ئەکێشێتە ناو کۆری خەباتی چەکداریەوە •

ساندینیستا لە بارەیدیاریکردنی ستراتیجی خۆیەوە سودێکی زۆری لە تاقیکردنەوەکانی شۆرشی کوبا وەر گرتبو ، ئیلهامی شۆرشگێرانەی لـــە راپەرینە چەکداریەکەی ساندینۆوەر گرتبو • لە دوای پێك هێنـــانی بەرە ، بەردەوام دەستی کرد بـــە کۆ کردنەوەو رێکخستنی لەشــکری چەکدار ، لە ساڵی ١٩٦٣ دا یەکەمین پەلاماری بردە ســـەر پاســـەوانە گەلیەکان لە هینـــدوراس •• لەو شەرانەیدا کـــە لـــە ناوچەکانی «کوکو»(١) و روبارەکانی «بوکی»(٢) کران لەشکری پارتیزانی بە توندی شـــکان •

---

(١) Coco. (٢) Bocayriver.

تێکشکانە سەرەتاییەکانی لەشکری پارتیزانی بون بە هۆی ئەوە کە ساندینیستا بۆ ماوەیەك چالاکی چەکدارانەی گەورەی خۆی رابگرێو لە ساڵەکانی ٦٤ ـ ١٩٦٥ دا دەستی کرد بە دامەزراندنی ئۆرگانێکی شێوە ئاشکرا بۆ ئەوەی لە رێگای ئەو رێکخراوەوە پشتگیری سیاسیانەی خەڵکی نیکاراگوا وەر بگرێو خۆی بۆ دەست وەشاندنی چەکدارانەی داهاتو ئامادە بکات • بۆ ئەم مەبەستە «بەرەی قوتابی یە شۆرشگێرەکان»و چەندان « کومیتەی خەڵکی شار » دامەزران • هەروەها ساندینیستا هەوڵی ئەوەی دا حزبی سوشیالیست را بکێشێتە ناو کێشەیەکی ئایدیۆلۆجیانەوە •

لەو ماوەیەدا «بەرە» توانی ژمارەیەك لە کۆمەڵانی خەڵك لەناو کۆمەڵە نیوە پرولیتاری یەکانو نیشتەجێ یانی دەورو بەری شارەکانو مەڵبەندە سنعەتی یەکاندا بۆ لای خۆی رابکێشێ •• هەروەها راگەیاندنو جموجوڵی چەکدارانەش لە ساڵی ١٩٦٦ دا لە چیاو کوێستانەکانا دەستی پێکرد • کرێکارە شورشگێرەکان ئەوانەی ئەمرۆ(١) کاروباری سەرکردەیی «بەرە» یان بە دەستەوەیە رۆڵێکی زۆر گەورەیان لە کاروباری سیاسیدا گێرا •

گەورە ترین دەسکەوتی راپەڕینی ساندینیستا لە ساڵەکانی ٦٠ ـ ١٩٦٧ دا ئەوە بو هێزە شورشگێرە پەردەوازە کانیان کۆ کردەوە ، رێگای راپەڕینی توندو تیژیان رونکردەوە ، درێژە یان بە پیلانی شەڕی شۆرشگێرانەدا ، ئەمانە سەرەڕای ئەو نوشوستی یە سەربازی یەی لە ساڵی ١٩٦٣ دا بە سەریانا هات •

لە ساڵی ١٩٦٦ دا ساندینیستا هەستی بە هەڵەکانی خۆی کرد ،

---

(١) ئەمرۆ •• مەبەست لە کاتی نوسینی کتێبەکەیە ـ ( وەرگێر )

بتکەیەکی پارتیزانی لە «پانکازان» کردەوە بۆ چالاکی نواندنی چەکدارانە لـە شارەکانا • ئەمەش لە کاتێکدا بو کە رووداڵـەتە شێوە ئازادی‌یەکـەی سەردەمی سەرکۆماری «شیك» تەواو ئەبو ، تاچیتو سوموزای خـۆی بۆ هەڵبژاردنی سەرکۆماری ئامادە کردبو • لـەو کـاتەدا کـە حزبی سوشیالیستو ئەپۆزیسیۆنی بۆرجوازی بە هەڵبژاردنەوە خەریك بون • ئالەو کاتە بەرەی ساندینیستا چـەندان دەستە کۆمەڵی چەکداری لە چیاو کوێستانەکانا دامەزراند •

شەڕ لە نێوان چەکدارەکانی ساندینیستاو پاسەوانە گەلی‌یەکانا دەستی پێکرد • لەگەل ئەوەدا کە پارتیزانەکان لە شـەڕی «پانکازان»دا شـکان ، ئەگـــەر لەگەل ئەنجامی هەڵبژاردنەکەدا بەراورد بکرێ سەرکەوتنێکی سیاسیانە بوو •• لەکـــاتی شەڕەکـــانی پانـکازان دا پەیوەندی نێـوان چەکدارەکـــانو جوتیارەکـــان بەتین تر بوو • ژمـــارەیەکی زۆری جوتیارەکان هاتنە ناو چەکدارەکانەوە •

## ٣ـ ستراتیجی تازە :

### شەڕی درێـژ خایەنی خەڵك

لە ساڵی ١٩٦٧ دا دوای شەڕی پانکازان سێیەمین قۆناغی راپەڕینی شۆرشگێڕانەی خەڵـکی نیکاراگوا دەستی پێـکرد • لەو ساڵەدا « بەرەی ئازادیخوازی گەلی ساندینیستا » ئەنجامی راپەڕینی چەکدارانەو پێنج ساڵ کاری سیاسیانەی رێکخراوەکانی وەر گرت ، ستراتیجێکی تازەی بە ناوی « ستراتیجی شەڕی درێژ خایەنی خەڵك »ەوە دانا ••

شەڕی پانکازان ، ئەگەرچی بە شکستی سەربازی بەرەی ساندینیستا

تەواو بو ، بەلام لە گەلێك بواری ترا ئەهمیەتێکی سیاسی زۆری هەبو ..
«ریکاردو مورالز» کە یەکێك بو لە چەکدارە ساندینیستەکان لــە بارەی
ئەهمیەتی شەڕی پانکازانەوە وتویە :

« پانکازان ئاسۆیەکی تازەی بۆ شـــەڕی خــەڵك
کردەوە ، لە هەمان کاتا ڕێــگای لـــە بۆرجــوازیو
ریفورمیستەکان گرت ، پانکازان توانای خەڵـــکی بۆ
پەلامار دانێــکی بەهێزی دژی ئالیــگارشیو ئیمپریالیزم
خستە جوڵـــە ، گیـانی شورشگێڕانەو لەخۆ بوردنی
هـــاندا ، ترسو خـــۆ بەدەستەوەدانو ورە بەردانی
لەناو برد » .

لە ساڵەکانی ٦٧ ــ ١٩٧٤ دا « بەرەی ئازادیخوازی گەلی ساندینیستا»
بە پێی ستراتیجێکی تازە کاری ڕێکخستنی خۆی لە ناوچە لادێیەکــانو
شارەکاندا سازدا ، بەرە هەوڵی دا ناکۆکی نێوان کاری خەڵكو کـــاری
دەرونی ڕێکخراوەکان بە شێوەیەکی مام ناوەندییانە چـارەسەر بـکات ،
یان کەمی بکاتەوە .. ئیشو کاری بێ سەرو بەرەی ڕێکخراوەکان گەلێك
گیرو گرفتی ئەنایەوە ؛ لە لایەکی تریشەوە نەبونی ڕێکخراوی خەڵــکی
بو بە هۆی ئەوە کە تا رادەیەك بەرە لە خەڵك جیـا بـکاتەوە . ئەبوا
ئەندامانی بەرە لە ناو خەڵــکە هوشیارو راپەڕیوەکانا ڕێکخستنی خـــۆی
پەروەردە بکردبایە . لە هەمان کـــاتا ئەبوا بەرە هـــەوڵی ئەوەی بدابایە
کۆمەلانی خەڵك کـــە لـــە واقیـــع دا توانای گۆڕینی مێژویان هەیەو
دروستکەری مێژون لە ڕێــگای ئۆرگانەکانی بەرەوە ڕێکیان بخاتو لـــە
دەوری خۆی کۆیان بکاتەوە .

ستراتیجی گشتی « بەرەی ئازادیخوازی گەلی ساندینیستا » شـەڕی درێژ خایەنی کۆمەلانی خەڵك بو ، کە لە پێناوی ئازادی گەلو کۆمەڵدا تێ ئەکۆشا ، ئیمپریالیزمی دەرەوەو کۆنە پەرستانی ناو خۆ کە لە لایەن بۆرجوازی مالیو ریژیمی دیکتاتۆری سوموزاوە پشتگیری‌یان لێ ئەکرا ، ئەمانە دوژمنی سەرسەختی گەلی نیکاراگوابون ٠

نیکاراگوا ولاتێکی سەرمایەداری یە ، بەلام قـۆناغی شـورشەکەی ناتوانێت سوشیالیستیانە بێت ، چونکە سەرمایەدارانی نیکاراگوا وەکـــو سەرمایە دارانی ئەوروپاو ولاتە سنعەتی‌یە پێشکەوتووەکان نین کە شورشی سوشیالیستیانەیان تیا بگونجێ ٠٠ هۆیە ستراتیجیو تاکتیکی‌یەکان قۆناغی سوشیالیزم ئەخەنە دواوە ٠

بەلام ئەگەر شۆرشی نیکاراگوا شورشێکی سوشیالیستیانە نەبێت ئەمە مانای ئەوە نیـە کە بەرەی ساندینیستا لە هـەوڵی بـە ئەنجـام گەیاندنـی شورشێکی دیموکراتی بۆرجوازی‌یانەدا نەبێت ٠٠ بورجوازی وەجـــاخ کوێری نیکاراگوا توانای ئەوەی نیە راپەڕینێکی دژی ئیمپریالیستیو دژی دیکتاتۆری بگرێتــە دەســتو رابەری بـکات ٠ لە لایـەکەوە پـرۆژەی شۆرشگێڕی بە مانای چارەسەر کردنی ناکۆکی‌یەکانە کە هەندێك لــــە سەرمایەدارە دواکەوتووەکانی نیکاراگوا دەستەو یەخەن لە گەلیا ، نـەك ئـەو ناکۆکی‌یـە دژی فیودالی‌یانـەی کە ماکـی شۆرشـــی بـۆرجوازی دیموکراتـین ٠

ئامانجـی شورشی دیموکراتـی خەڵـك لە ناوبردنـی دیـکتاتۆری سوموزابو ، ئەم شۆرشە ناتوانێ یەکسەر بگاتە قۆناغی سوشیالـیزم ٠ ٠ چونکە هەمو توێژەکانی خەڵك ــنەك تەنیا پرۆلیتاریاــ لە دژی ئیمپریالیزمی

بەتی‌و دیکتاتۆری سوموزا راپەڕیون • لەم روەوە حکومەتێکی شورشگێڕی خەڵك جێگای رێژیمەکە ئەگرێتەوە •

پێویست‌بو حکومەتی شۆرش بە گورجی دەزگا ئینحساریە مالی‌یەکان‌و سامانی سوموزاو ، سەرمایە ئینحساری‌یەکان‌و بەشی بەرهەم هێنەرە کشتوکاڵی‌یەکان کە بە دەست خاوەن ملکە لاتیفۆندی‌یە کانەوە بون ، بگرتبایە ژێر دەستی خۆی ••

حکومەتی شۆرش سنعەتی نیشتمانی پەرە پێ بدات‌و بە یەکجاری دەسەلاتی سیاسی‌و ئابوری ئیمپریالیزم لەناو ببات •• دەست گرتن بە سەر بانقەکانا ، نەهێشتنی بێکاری لە شارو لادێکان ، بەر گرتن لە ناخۆشبوونی ژیان ، زۆر کردنی کرێی رۆژانەی کرێکاران ، خۆماڵی کردنی کومپانیا ئینحساری‌یەکانی دەرەوە ، هێنانەدی دروشمی« زەوی هینی ئەو کەسەیە کاری تیا ئەکات » • ئەمانە هەمو ئەرکی سەرشانی شۆرشن •

شۆرشی دیموکراتی ئەبوا «پاسەوانی گەلی» گرێدراو بە ئیمپریالیزمەوە لەناو ببات‌و لە جێگای ئەو لەشکری خەڵك کە کرێکارو جوتیاران بڕ بڕە پشتی ئەو لەشکرەن‌و داکۆکی لەسەر قازانجی شۆرش ئەکەن ، پێك بێنێت •

ئەو هێزانەی بەشداری شۆرشیان کردوە ، حکومەتی شۆرشی خەڵك دابمەزرێنن کە بریتین لە کرێکاران ، جوتیاران ، مەزهەبی‌یە پێشکەوتنخوازەکان ، سەربازە نیشتمان پەروەرەکان ، تۆیژی ناوەڕاست‌و خواروی خەڵکی شارو لادێ،بۆرجوازی‌یە بەرهەڵستکارەکان،رۆشنبیران‌و قوتابیان‌و هەمو توێژەکانی خەڵك بەژن‌و پیاوەوە ، جوان‌و پیر ، پێست

سوزەکان ، رەش پێستەکان ، سپی پێستەکان •

چینی کرێکار هێزی رابەریکاری شۆرشن ، کە هۆشیار تریـن‌و بەشترین ئەندامیان لە بەرەی ئازادیخوازی گەلی ساندینیستا کۆ بونەتەوە• بە پشتیوانی ئەو هێزە رەسەنانەوە سەربەخۆیی گەلی‌و دیموکراتی زامن ئەکرێ‌و شۆرشی دیموکراتی خەڵك هەل‌و مەرجی لەبار بۆ قـۆناغی بونە سوشیالیزم ئەرەخسێنێ •

شۆرشی دیموکراتی خەڵك ئەرکی بنچینەیی خۆی بە کۆمەڵانـی خەڵکی لادێ ئەسپێرێ •• سەرنجی تایبەتی لادێکان ئەدات ، بەو مانایـە کە لادێکان بە لاوازترین شوێنی دەسەڵاتی دوژمـن دائەنرێـن‌و هـێزی سەرەکی سوموزا لە شارەکاندایە • هەروەها مەسەلەی زەوی‌و زار گەورە ترین مەسەلەی شۆرشی نیکاراگوایە ، لەبەر ئەمە پایەی پاراستنی خەڵك لە لادێکاندا ئەبێت •• کرێکارە کشتوکاڵی‌یەکان گەورە ترین بەشی چینی کرێکار بون‌و شان بە شانی جوتیارەکان بە گەورە ترین پشتیوانی شۆرش دائەنرێن • لەم روەوەیە کەوا لەشکری خەڵك بە تەواوی لە لادێکاندا سەر هەڵ ئەدات • هەروەها بەرەی ساندینیستا بەشێوەی نیوە نهێنی‌و نیـــوە ئاشکرا لەناو دەرونی یەکێتی‌یەکانی کرێکاراندا کاری ئەکرد •

لە رێگای یاسایی‌و ئاشتیانەوە هەرگیز ریژیمی سومـوزا لەنـاو ناچێت • لە کاتێکدا هێزی سەربازی ئیمپریالیزم لە وڵاتی نیـکاراگوادا نەبو ، چارەسەری ناکۆکی‌یەکانی نێوان خەڵك‌و رێژیمی سوموزا لـە رێگای شەرێکی ئازادیخوازانەوە نەئەبو ، بەڵکو لە رێـگای شۆرشی ناو خۆیەوە چارەسەر ئەکرا • شەرو شۆرشی ناو خۆیی تەنیا رێگایە بۆ لەناو بردنی حوکمی دیکتاتۆری‌یانەو دامەزراندنی حکومەتی شۆرشگێرانـەی خەڵك • راپەرینی شۆرشگێرانە ئەبوا بە هەر جۆرێك بوایە دەستێوەردانی

بێگانەی لە وڵات دور بخستبایەتەوە ، چونکە دەستێوەردانی سوپـــایـی ئیمپریالیزم ئەبوە هۆی درێژە پێدانو خوێناوی تر کردنی راپەڕینەکە .

بەرەی ساندینیستا لەو ماوەیەدا بو کە دەستێوەردانی سوپایی بێگانە پرۆژەی راپەڕینو ستراتیجو تاکتیکی ئیستا (١) بە گشتیو لە بنەڕەتـەوە ئەگۆڕێت . لەو کاتەشدا «بەرە» ناچار ئەبو داوای یارمەتی لە دەوڵەتـــە دۆستو پێشکەوتووەکان بکات .

لــە دوای پێك هاتنی « یەکێتی دیموکراتی ئـازا دیخــوازانەی ـ یودل » بەرەی ساندینیستا ئەوەی ئاشکرا کرد ، کە لەگەل ئەوەشـــدا ئەم یەکێتییە ئەتوانێت رۆڵێکی گەورەو بەدیار لە راپەڕینەکەدا بگێڕێ .. بەڵام « بەرە » هەرگیز ئامادە نیە بەشداری لەگەلدا بکات وە یان بەرنامــە ریفورمیستیو سازاندنەکانی قبوڵ بکات . لەم روەوە زۆر سەرزەنشتی حزبی سوشیالیستی نیکاراگوای کرد لەناو ئەو یەکێتییەدا .

لە ساڵی ١٩٧٣ دا زیاتر لە سێ هەزار کەس خەڵکی ناوچـــەی « سابتیاوا » ئەوەیان ئاشکرا کرد کە ئامادەن گیانی خۆیان لە رێـــگای پاراستنی وڵاتە کەیانەوە بەخت بکەن .

لە ساڵی ١٩٧٢ دا سـەرتا سـەری ئەمەریـکای ناوەنـد دوچاری گێژاوی ئابوری بو ، لە لایەکی تریشەوە بومەلەرزەکەی « ماناگوا » لە هەمان ساڵدا وڵاتی دوچاری گێژاوێکی قوڵ کردبو .

سوموزا بە هۆی سود وەرگرتن لە ٢٥٠ ملیۆن دۆلار کـە بــە یارمەتـی لــە وڵاتەکانـی دەرەوە دابویان بـە زیـــان لێکەوتووەکانـــی بومەلەرزەکە ، دەسەڵاتی ئابوریو سیاسی خۆی مەحکەم تر کرد .

---

(١) کاتی نوسینی کتیبەکە .. ـ وەرگـێڕ ـ .

له دوایی بومەلەرزەکە چەند بڕیارێك لە بارەی کەمکردنەوەی کرێی ڕۆژانەو زۆر کردنی سەعاتی ئیشکردن درا ، کە بو بە هـۆی هەلچونو ڕاپەڕینی کرێکاران •

لە ساڵەکانی ۱۹۷۳ - ۱۹۷٤ دا چەندان مانگرتنی کرێکارانی ڕستنو چنین، خانوو بەرە ، حەوجۆش سازی ، باخە مۆزەکان، نەخۆشخانەکان کار گوزاری گشتی دەستی پێکرد • بەرەی ساندینیستا زۆر هەوڵـی دا ڕۆڵێکی گەورە لە ڕێکخستنی کرێکاراندا بگێڕێو توانی لـەناو دەرونی ڕێکخراوە کرێکاری‌یەکاندا ئەو ڕابەرانە بکاتە دەرەوە کە لایەنـگری دەوڵەت بون لە « یەکێتی کرێکارانی خانووبەرە » و « یەکێتی کرێکارانی تەندروستی » دا • جگە لەوەش دەستی کرد بە کۆ کردنەوەو ڕێکخستنی کرێکارە لادێ نشینەکانی دەورو بەری شارەکان •

قەشە لایەنگرەکانی بەرەی ساندینیستا توانی‌یـان
شەپۆلێکی تازەی ڕاپەڕین لە کلیساکانـدا بخولقێنن •
کلیساکان بە هۆی پیاوە مەزهەبی‌یە پێشکەوتووەکانەوە
بون بە سەنگەری ڕاپەڕینو خۆ ڕێکخستنو کۆبونەوە•

بەرەی ساندینیستا کاروباری ڕێکخستنی لەناو توێژەکانی خەڵـكدا پەرە پێدا • ڕێکخستن لەناو دانشگاو قوتابخانە ناوەندی‌یەکانا دەسـتی پێکرد • هەروەها بەرەی ساندینیستا لە بواری نێو دەوڵەتانیشدا کەوتە خۆ دەرخسـتنو چـالاکی نوانـدن ، پەیوەنـدی لەگـەل ڕاپەڕینـە شۆڕشگێڕی‌یەکانی ئەمەریکای لاتین‌دا بەهێز بو • لە زوربەی ناوچەکانی تری جیهان [ بە تایبەتی وڵاتە یەکگرتوەکانی ئەمەریکاو ئەوروپا ] چالاکی زۆر بۆ ناسینی ڕاپەڕینی خەڵکی نیکاراگوا دەستی پێکرد • ئەم چالاکی‌یانە

زەمینەی بۆ وەرگرتنی یارمەتی مادیو مەعنەویو هاریکاری نێو نەتەوەییانەی خەڵك بەرامبەر بە راپەڕینی خەڵکی نیکاراگوا رەخسان •

لە ساڵی ١٩٧٤ دا چالاکی چەکدارانەو کاروباری راگەیاندن لە ناوچە شاخاویەکانا زۆر بو • پاسەوانە گەلی‌یەکان بۆ سەرکوت کردنی ئەو چالاکی‌یانە کەوتنە خۆ ، لە پاش شەڕێکی توند لەگەل سەربازەکانی سوموزا دا بڵاو کرایەوە کە پاسەوانە گەلی‌یەکان هێزەکانی ساندینیست یان لەناو بردوە راپەڕینی چەکدارانە تێکشکاوە • لە کاتێکدا دەزگا راگەیاندنەکانی سوموزا هەوڵی ئەوەیان ئەدا کە بە خەڵکی بسەلمێنن راپەڕینی چەکدارانە لەناو چووە ، کەچی هەر لەو کاتەدا روداوی ٢٧ی ئەیلولی ساڵی ١٩٧٤ رویدا •

هەر لەو رۆژەدا دەستەیەك شۆرشگێڕی ساندینیستا چونە ماڵی یەکێك لە بازرگانە هەرە دەوڵەمەندەکانی نیکاراگواوە کە میوانداری کریسمسی بۆ باڵوێزی ئەمەریکا ساز کردبو ، ژمارەیەك لە میوانەکان یان دەسگیر کرد کە لەوانە ١٢ دوازدە کەسیان لە دۆستو دەورو بەرەکانی سوموزا بون • دەوڵەتی ئەمەریکا ناچار بو پەیوەندی بە ساندینیستاوە بکات بۆ ئەوەی باڵوێزەکەیان بەرئلا بکەن • لە دوای شەست سەعات گفتوگۆ کردن سوموزا ناچار بوو داخوازی‌یەکانی بەرەی ساندینیستا جێ بەجێ بکات ملیۆنێك دۆلار پارەو چواردە زیندانی سیاسی بەرە کە گیرابون بەرەڵلایان بکاتو ریگایان بدات بڕۆن بۆ کوبا •• جگە لەوە سوموزا ناچار بو رێگا بدات بەیاننامەی دوازدە هەزار وشەیی « بەرەی ئازادیخوازی گەلی ساندینیستا » کە ریژیمی سوموزای تیا ریسوا کرابو لە رادیۆی دەوڵەتیو هەمو رۆژنامەکانی وڵاتدا بڵاو بکرێتەوە • کاتێك زیندانی‌یە سیاسی‌یە گیراوەکان بەرەڵلا کرانو ویستیان نیکاراگوا بەجێ

بهێڵن به هەزاران کەس لە فرۆکەخـــانە کۆ بوبونەوەو هاواریان ئەکرد « بژی ساندینیستا »و بەرێزەوە بەرێ کران • چالاکی ۲۷ی ئـەیلول کارێـکی گەورەی کردە سەر رای جیهانیو نیکاراگوا بە تایبەت •• بونی ئەپۆزیسیۆنێکی بەهێزو شۆرشگێری لەناو کۆمەڵانی خـەڵكدا بەجیهـان سەلماند • ئەو دادگا سەربازییانەی کە دوای ئەم پەلامار بردنە دامەزران بۆ رونکردنەوەی چالاکییە کانی بەرە ، ئەوەیان بۆ رون بۆوە کە بەرەی ساندینیستا نەك تەنیـــا لە لایەن هەندێك لـــە کرێکارانو جوتیارانەوە پشتگیری لێ ئەکرێ بەڵـکو ژمارەیەکی زۆر قەشەی کـاتۆلیـكو کورە ئەفسەری پاسەوانە گەلییەکانو ئەندامانی بنـە ماڵـــە دەوڵەمەندەکـانی نیکاراگواو تەنانەت هەندێك خاوەن کارخانە سنعەتیو بازرگانە گەورەکان کە لەگەل سوموزادا پەیوەندی دوستانەیان هەیە ئەمانە هەمو پشتیوانی لـە بەرەی ساندینیستا ئەکەن • هەروەها لەو باوەڕەدا بون کە هەندێك لـــە میوانەکانی میوانداریيە کریسمسەکە لە ژێرەوە پەیوەندییان لەگـــەل شورشگێرەکاندا هەبوە • چالاکییەکی زۆر دەستی پێکرد سوموزا بـــە توندی لێی ئەدان ، ریژیم ناچار بو هێزێکی دژی پارتیزانی شان بە شانی پاسەوانە گەلییەکان دامەزرێنێت •• ژمارەیەکی زۆر کرێگرتەی شـەڕ کەری چەکدار کرد ، راوێژ کارانی سەربازی ئەمەریکا [ کە لـە شەڕی ڤێتنامدا فێری شەڕی دژی پارتیزانی بوبون ] کران بە سەرکردەی بەشـە پاسەوانە گەلییەکانو نێردران بۆ ناوچـەکانی ژورووی وڵات • دەستیان کرد بە پاك کردنەوەی ناوچەکـــان لـــە چەکدارە شۆرشگێرەکان • • حکومەتی سەربازی لە وڵاتدا دانرا ، سانسۆرێـکی توند خرایە ســـەر بۆستـــە خانەکانو چاپەمەنیەکـــان ، ئەو ناوچانەی گومـــانی لێ ئەکرا چەکداری شۆرشگێری تیا بێت پەیتا پەیتا بۆمباران ئەکران • بە هەزاران جوتیاری بێ گوناح لەو گولە تۆپ بارانانەدا کوژران •• زۆر کەس بـە

دیلی گیرانو چەندان کەسیش رایانکرد بۆ دەرەوەی وڵات •

لە ساڵی ١٩٧٥ دا چەندان پێکدادانی سەربازی لە نێوان چەکدارە ساندینیستەکانو پاسەوانە گەلیەکاندا رویدا ، لە هەندێك لە پارێزگاکانی وڵاتدا بە رادەیەك چالاکی شۆرشگێرانە تەشەنەی کردبو کە ناوچەکان یەکسەر بوبونە جێگای شەرو لێکدان •

رۆژ بە رۆژ زیانی پاسەوانە گەلیەکان زیادی ئەکرد ، تەنانەت تەنیا لە نیوەی یەکەمی ساڵی ١٩٧٥ دا زیاتر لە شەست کەس لە ئەندامانی پاسەوانە گەلیەکان کوژران • بە پێی راپۆرتی رۆژنامە گەری ئەمەریکا لەو ساڵەدا پاسەوانە کان تەنیا دەسەڵاتیان بەسەر شارەکاندا هەبو ، لادێکان بە زۆری بە دەست شۆرشگێرەکانەوە بوون •

زۆر جار سەربازەکان سەرپیچییان لە شەڕ کردن ئەکرد ، تەنانەت هەندێکیان رایانکرد بۆ دەرەوەی وڵات •• راپەڕینی پارتیزانەکان لە لادێکاندا بووبە راپەڕینی تەواوی خەڵك ••

## ٤ـ دوبەرەکایەتی لە راپەڕینی شۆرشگێرانەدا

دەست وەشاندنی سەرکوتکەرانەی پاسەوانە گەلیەکان نەیتوانی راپەڕینی کۆمەڵانی خەڵکی نیکاراگوا رابوەستێنێ ، مانگرتنو خۆ نیشاندان بە جۆرێکی بێ وێنەیی لێ هات • خەڵکی نیکاراگوا چاوەڕوانی شۆرشیان ئەکرد ، ناکۆکی لەناو دەرونی بۆرجوازییە گرێدراوەکانی نیکاراگوادا وای لێ هات تواناى خۆ راگرتنی نەمێنێ •• بەرەی ئازادیخوازی گەلی ساندینیستاش بەرامبەر بەم روداوانە بێ لایەن نەمایەوە ، چەندان پرسیاری گرنگ لە زەمینەی ستراتیجو تاکتیكدا هاتە

پێشەوە ، کە رەخنەیان لە ستراتیجی پێشووی بەرەیساندینیستا ئەگرت •

چەکدارە ساندینیستەکان خۆیان وەکو پێشەنگو رابەری کـــاری سیاسیانەی خەڵك نیشان ئەدا ، تا ئەو رادەیەی ئەپۆزیسیۆنی بۆرجوازی ناچار بوبون ئەو نەخشەی بەرەی ساندینیستا بۆ دوارۆژی نیکاراگوای کێشابو پێی قایل بن • هەمو لایەنێك ئەوەی بۆ دەرکەوتبو کە بە بێ بەشداریکردنی ساندینیستا هیچ جۆرە گیرو گرفتو گێژاوێکی سیاسیو ئابوری لە وڵاتدا چارەسەر ناکرێ ••

یەکێك لە خاسیەتە تایبەتیەکانی بەرەی ساندینیستا ئەوەبو کـــە تاکو ئەو کاتە پێچەوانەی هەمو هێزە پارتیزانیەکانی وڵاتانی ئەمەریکای لاتین توانیبوی لـــە لایەکەوە درێژە بە رابەرایەتی کردنی راپەرینەکە بداتو لە لایەکی تریشەوە بەرگیری لـــە هەر دوبەرەکـــایەتیـــەکی دەرونی «بەرە» بکات •

ئایا ئەبوا چالاکی‌یەکانی بەرەی ساندینیستا لە شارەکان یان لـــە شاخـــەکانا بوایە ؟ ئایا پێویست بـــو لایەنی ســـەربازی یان سیاسی سەرکردایەتی راپەرینەکەی بکردبایە ؟ ئەبوا چ جۆرە پەیوەندی‌یەك لە نێوان بۆرجوازی‌یەکانی دژ بە ریژیمو بەرەی ساندینیستادا هـــەبایە ؟ ئەبوا چ جـــۆرە دروشمو داخوازی‌یەك لـــە دەرونی خەڵـــکدا لێك بدرابایەتەوە ؟ ئەبوا پەلاماری سەربازی لە دەرەوەی وڵات یان ناوخۆی وڵات ساز بدرابایە ؟ ئایا زەمینەی شۆرش لەناو خەڵـکدا ئامادە بو ، وە یان مەسەلەی دەسەڵات گرتنە دەست لە بەرنامەی کاردا دانرابو ؟ لـــە هەمو گرنگتر ئەبوا چ جـۆرە حکومەتێك لـــە دوای حوکمی سوموزا جێ‌نشینی دەسەڵات بوایە ؟

وەڵامی ئەم پرسیارانە لە دەرونی «بەرە» دا بــە سێ جــۆر وەڵام ئەدرایەوە ••

لەو باوەڕەدا بو شۆڕشگێڕەکان لە چیاکانا دور کەوتونەتەوە لە چینی کرێکاری سنعەتی ، کەمبونەوەی رادەی کشتوکاڵ کارەکان لەدێکاندا بۆتە هۆی گەشــە کردنی چینی کرێکار لە شارەکاندا • بەمجۆرە پشــت بەستنی بە جوتیارو کرێکاری لادێــکان « بەرە » لــە کرێکاری شارەکان دور ئەخاتەوە ••

شەڕی درێژ خایەنیان بــەلاوە کارێکی بــاش‌و سەرکەوتوانــە بــو ، لەو بــاوەڕەدا بــو کە دەســتە چەکدارەکان پێشەنگی بنچینەیی راپەڕینەکەن ، لــە دوا لێــکۆڵینەوەدا دەر کــەوت کە تەنیــا چــەکداری لادێــکان توانــی ریژیمی ســوموزاو دەســەو دایــەرە داپڵۆسێنەرەکەی بێنێتە سەر چۆکو راپەڕینەکــە لــە شارەکاندا پەرە پــێ بــدات •

لە کانونی‌یەکەمی ساڵی **١٩٧٥** دا رابەرەکــانی ناوخــۆی وڵات لایەنگرانی پرۆلیتاریایان دەرکردو بەمجۆرە یەکەم دوبەرەکایەتی لـــە نێوان بەرەدا رویدا •• لەوە بەدواوە پرۆلیتارەکان رێکخستنی خــۆیــان جیا کردەوە ، بەلام هەر بە ناوی بەرەی ئازادیخوازی گەلی ساندنیستاوە [ هێزی سێیەمەوە ] هەوڵ‌و تەقەللایەکی زۆریان دا کە ئەو دو هــێزەی نر نزیك بخەنەوە لە یەکتر ••

لە ساڵی ١٩٧٦ دا دو کەس لە ئەندامانی سەر کردایەتی گەلی کە ناویان « کارلوس فونسەکا ئامـــادور » Carlos Fonseca Amador سکرتێری گشتی « بەرە » وە « ئـەدواردو کانترراس ئاسـکوبار » بـــو Edwardo Contreras Escobar هاتن بۆ نیکاراگوا تاکو ناوبژی ئەو ناکۆکی‌یانە بکەن ، ئەو دو کەسە لە ئەندامە ناودارو دەرکەوتوەکانـــی بەرەی ساندنیستا بون ، دوای ئەوەی گەڕانەوە لە شەڕێکیدا شەهیـــد کران • لـــە هەمان شـــەڕدا « توماس بـــورگ » Thomas Borge رابەری دەستەی لایەنگرانی شەڕی خەڵـکی دەسگیر کراو ئـیتر ئـەو دەستەیە قسەکەریان نەما •• لەو کاتەدا گەلێك روداوی گەورە رویدا ، هێزی سێـیەم کە دوایی بە « ترسریستاس » Terceristas ـ لایەنگرانی راپەڕین ـ ناو نرا پاش رێ نەکەوتنەکە چەند تیوری‌یەکـی تازەی بـۆ خۆی دانـــا •

ترسریستاس باوەڕی بە راپەڕینی چەکدارانە هەبو ، لایەنگرانـــی ئەم دەستەیە ئەیانووت کە هەلو مەرج بۆ راپەڕینەکە لە بارە ، خەڵـکی بە گشتی لە سوموزا بێزارن • خەڵکی ئامادەی راپەڕینن • دروشمـــی ئەوانە بریتی بو لە « شەڕ لە پێناوی رێـکخستن‌و رێـکخستن لە پێناوی شەڕدا تا سەرکەوتن » ئەوانە لەو باوەڕەدا بون کە یەك دەست وەشاندنی سەربازی‌یانە ئەبێتە هۆی راپەڕینی تێکڕای خەڵك •

جگە لەوە « ترسریستاس » لەو باوەڕەدا بو کە پێویستە بۆ ئەوەی راپەڕینەکە سەرکەوتو بێت هەمو هێزەکانی دژی سوموزا کۆ بکرێنەوە • ئاڵۆزی باری ئابوری بۆرجوازی‌یەکان ئەتوانێت وەکو هێزێکی سەربازی یارمەتی راپەڕینەکە بدات •• بەرەیەکی هەمە لایەنیانەی فراوان بـــە هاریکاری بۆرجوازی‌یەکان‌و لە ژێر سەرکردایەتی ساندنیستاداو بە پێی

بەرنامەیەکی پێشکەوتوانە ئەتوانێ دیکتاتۆری لە ولاّتدا لەناو ببات ..
دوای لەناوبردنی سوموزا دەوڵەتێکی کاتی دیموکراتیك بە هاریکاری ساندینیستا پێویستە دابمەزرێت کە پاسەوانە گەلی‌یەکان هەمو هەڵوەشێنێتەوەو هەمو دارایەکی سوموزا میلی بکاتو هەمو بانقە تایبەتیەکان بکاتە مڵکی دەوڵەتو هەڵبژاردنێکی ئازاد بێنێتە کایەوە بۆ هەڵبژاردنی حکومەتی تازە .

لەگەڵ پەیدا بونی دوبەرەکایەتی سێ لایەنیانە لەناو دەرونی بەرەی ساندینیستادا هەریەك لە لایەنە دو بەرەکی‌یەکان بەرنامەو ئامانجی سیاسی خۆی هەبو لە سەری ئەڕۆیشت .. لەو کاتەدا ریژیمی سوموزا بە توندی راپەڕینەکەی بە گشتی سەرکوت ئەکرد . راپەڕینەکەش لە لایەکەوە لە دەرونی خۆیا لاواز بوبو ، بو بو بە سێ بەشەوە هەریەکە ئامانجی سیاسی خۆی جیا بو ، لە لایەکی تریشەوە لە لایەن هێزەکانی سوموزاوە بە توندی لێ‌یان ئەدرا .

جیاوازی بیروڕا لە نێوان ئەو سێ لایەنەدا لە دوایدا پەرەی سەند، دو لایەنەکەی تر لەگەل رێبازی « ترسریستاس» دا نە ئەگونجان کە لە دەرەوەی نیکاراگواوە پشتگیریان لێ ئەکرا . رەخنەیان لە پەیوەندی دۆستانەی نێوان ترسریستاسو حزبە سۆشیال دیموکراتەکانی ئەوروپا ئەگرتو سەرزەنشتی ئەو یارمەتیانەیان ئەکرد کە لە لایەن ریژیمەکانی سۆشیال دیموکراتەوە بۆیان ئەهات .

بونی هەندێك عونسوری لیبرال لەناو ئەو لایەنەدا ئاگری ناکۆکی‌یان خۆشتر ئەکرد ، بە تایبەتی دوای ئەوەی یەکێك لە رابەرەکانیان بلاّوی کردەوە کە ئامادەن بەشداری هەڵبژاردنی سەرکۆماری ساڵی ١٩٨١ بکەن .

## ٥ـ بەرەو ئازادی گەلی

لە ساڵی ١٩٧٧ دا جارێکی تر سوموزا بلاوی کردوە کە پاسەوانــە گەلی‌یەکان چەکدارەکانی بەرەی ساندینیستایان لەناو بردوەو ئیتر رێــگای هیچ جموجوڵێکیان نەماوە • لە مانگی مارسی هەمان ساڵدا باڵوێزخانـــەی ئەمەریکا قسەکانی سوموزای بە راست داناو بلاوی کردەوە کە لە ماوەی ساڵی ٩٧٦ دا پاسەوانە گەلی‌یەکان دەستی زەبرو توندیان لە چەکدارەکانی ساندینیستا وەشاندوە ، کارێکی وایان بە چەکدارەکان کردوە کە ئیتر هیچ مەترسی‌یەکیان بۆ سەر ریژیم نەماوە ، نیکاراگوا لە دوا رۆژێکی سیاسی بــە ئارامــدا ئــەژی •

لە مانگی تشرینی یەکەمی ساڵی ١٩٧٧ دا ریژیمی سوموزا حکومەتی سەربازی هەڵوەشاندەوەو سانسۆری لەسەر چاپەمەنیەکان کەم کردەوە ، لە مانگی کانونی‌یەکەمی هەمان ساڵدا چـــەندان مانــگرتنی خەڵــکی‌و کرێــکاران رویدا •• ئاڵۆزی کرێــکاران هەمو شارەکــانی داگرت ، راپەرینی قوتابیان بەتەواوی بە هێز بوو ، رۆژنامەکان دەستیان کرد بــە سەرزەنشتی کردنی ریژیم‌و داب‌و دەزگاکەی •

لـــە رۆژی ١٧ی مانگی کانونی‌یەکەمی ساڵی ١٩٧٧ دا هێزەکانی «سرتریستاس» پەلامارێــکی هەمــە لایەنی بردە سەر چـــەند شارێــکی نیکاراگوا لەوانە شاری «ماسایا» بو کە ٣٠ میـــل کەوتوتە لا خــواروی پایتەختەوە • چەکدارەکان توانیان ماوەیەك شەقامەرێگای نێوان «ماسایا»و «ماناگو» بگرنە ژێر دەستی خۆیان‌و رێگای هاتو چۆی هێزەکانی سوموزا بگرن • ریژیم ناچار بو شاری «ماسایا» بە فرۆکە بومباران بکات •

سـەر لـە بەیانی رۆژی دوایی «دەستەی دوازدە کەس»(۱) ، بەیاننامەیەکیان لە «کستاریکا» دەر کردو داوایان لە هەموو خەڵك کرد کە پشتگیری لـە چەکدارەکانی ساندینیستا بـکەن •• دەستـەی ناوبراو ساندینیستەکانی بە سیاسی زان دائەناو ئەیوت پێویستە بۆ هـەر جـۆرە چارەسەر کردنێکی گیروگرفتی ناو خـۆی نیـکاراگوا ساندینیستەکان بەشدار بن • هەر لەو کاتەدا حکومەتی « کستاریکا » پشتگیری تاکتیـکی خۆی بۆ ساندینیستا ئاشکرا کردو رێـگای دان بنکە کـانی خۆیان لـە وڵاتەکەیا دابنێن •

ئەو دەستەی داوای شەڕی خەڵـکی ئەکرد ئەوانیش پەلاماریان بردە سەر مەڵبەندەکانی ریژیم لە چیاکـانی ژووروی وڵاتدا ، چەند شارێکی بچوکیان گرتو رێگای هاتو چۆی هێزەکانی ریژیمیان بەربەست کرد •

« دەستەی پڕۆلیتاریایی » ئەوانیش چـەند کومیتەیەکی کرێـکارە شۆرشگێڕەکانیان لە شارەکاندا دامەزران ، قوتابیانیش لەگەڵ کۆمـەڵانی خەڵـکی ترا داوای بەرەڵلا کردنی چەکـدارە گیراوەکانیان ئەکـردو داوایان ئەکرد ئەو فـەرانەی پاسەوانە گەلی‌یەکان سزا بدرێن کە بونەتە هۆی کوشتن‌و لەناو بردنی ۳۵۰ چەکداری شۆرشگێڕ •

سوموزا ئەگەرچی توانی شاری «ماسایا» بگرێتەوە بەڵام نەیتوانی راپەڕینەکە سەرکوت بکات •• پاسەوانە گەلی‌یەکان زۆر بە بێ شەرمـانە دەستیان لـە خەڵك ئەوەشاند •• ئەو لادێیانەی لـەژێر دەسـەڵاتی چەکدارە پارتیزانەکانی [ دەستەی لایەنگری شـەڕی خەڵـکی ] دا بون

(۱) تەماشای بەشی سێیەم بکە •

هەمویان سوتێنران ‎..‎ لادێکان بە بۆمبای ناپاڵم وێران کران ‎.‎ خۆ نیشاندانەکانی خەڵك لە لایەن کۆمەڵە نیمچە سەربازی‌یە فاشیستەکانەوە کە حزبی «لیبرال سوموزا» سەرپەرشتی ئەکردن ، قەلاچۆ ئەکران ‎.‎

سوموزا بۆ ئەوەی دوژمنەکانی خۆی لێك جیا بکاتەوە ، داوای وتووێژی لە ئەپۆزیسیۆنی بۆرجوازی کرد ، بەڵام ئەم تەقەللادانەی سەری نەگرت ‎.‎ بۆرجوازی لەگەل هەمو لایەنەکانی دژی ریژیم‌دا دەستی کرد بە گفتوگۆ کردن ‎.‎ « پدرو شامورو » رابەری [ یەکێتی دیموکراتی ئازادیخواز ](١) پەیوەندی لەگەل باڵوێز خانەی ئەمەریکا ، پاسەوانە گەلی‌یەکان ، دەستەی ترسریستاس ، بەرەی ساندینیستا دا بەستبوو ‎.‎ ئەمکارەی شامورو لەوە زۆرتر بوو کە سوموزا بتوانێ جێ‌بەجێی بکات ‎.‎

لە رۆژی ‎١٠‎ی ‌کـدوەمی ‎١٩٧٨‎ دا پدرو شامورو بە گوللەیەك لە «ماناگوا» کوژرا ‎.‎ دوابەدوای ئەوە گەورەترین شەپۆلی راپەرینی خەڵك لە مێژوی نیکاراگوا دەستی پێکرد ‎.‎ رۆژی ‎٢٠‎ی‌مانگ کرا بە رۆژی ئازێتی گەل ‎.‎ لەرۆژی ‎٢٢‎ ی مانگدا بازرگانەکان مانیان گرت ‎..‎ رۆژی ‎٢٣‎ی مانگ حەوت هەزار کرێکاری خانوو بەرە دەستیان لە کار هەڵگرت‌و داوای رونکردنەوەی کوشتنی شامورویان ئەکرد ‎.‎

بەجێ هێنانی ئازێتی گشتی وەکو خۆ نیشاندانێکی سیاسی دەرکەوت ، لەگەل ئەوەدا کە پاسەوانە گەلی‌یەکان هەمو شەقامە رێگاکانی دەورو بەری شاریان گرتبو ، بە دەیان هەزار کەس لەو خۆنیشاندانانەدا بەشداری‌یان کردبو ‎.‎ خۆ نیشاندەرەکان دروشمی بمرێ «سوموزا»و «بژی ساندینیستا» یان بەرز کردبۆوە ‎.‎ پەلاماری کومپانیا کانی سوموزاو

(١) تەماشای بەشی سێیەم بکە ‎..‎

دەزگا ئینحیساری یەکانی گرێدراو بە ئەمەریکایانەوە ئەدا .. بەشەکـانی « بانقی شاری نیویورك »و کومپانیای «پلاسما فریس» ، [ئەو بانقە خوێنەی کە خوێنی لە خەڵـکی هەژاری نیکاراگوا ئەکڕی بە هەرزانو بـە گران ئەیفروشتەوە بـــە ئەوروپایی‌و ئەمەریـکایەکان]و کارخانەیەکی رستن‌و چنین‌و چەندان دەزگـاو دامـەزراوی تری ئیمپریالیستیانەیان سوتاند .. پاسەوانە گەلی‌یەکان بە هۆی گازی فرمێسك هێنەرو تەقە کردن بە ئاسمانا خۆ نیشاندەرەکانیان بڵاوە پێـکرد . لـەو خۆنیشاندانانەدا یەکێك کوژراو دەیان کەسیش بریندار بون .

خۆ نیشاندانی سەرتاسەری نیـکاراگوا تا ۷ی مانـگی شوبات درێژەی کێشاو ئابوری بە تەواوی ئیفلیج کرد . قەشە کاثۆلیکەکان پشتگیری خۆیان بۆ خۆنیشاندەرەکان دەر بڕی ..

بەرامبەر بەو خۆ نیشاندانانە سوموزا هاواری کرد کە بە هیچ جۆر دەستی لە کوشتنی شامورودا نیە . پولیسی نیکاراگوا کوشتنی شامورویان خستە ئەستۆی یەکێك لە رابەرانی پەنابەرە کوبایەکان کە ناوی «رموس» وە سەرۆکی بانقی خوێن بو .

لە شوباتی ساڵی ۱۹۷۸ دا لەناو شەپۆلی راپەڕینی خەڵکدا ، بەرەی ساندینیستا دەستی بە کار کردن کرد ، لایەنی لایەنگری شەڕی خەڵـکی چەند پەلامارێکی پارتیزانیانەیان ساز دا ، چەکدارو لایەنگرەکانی « بەرە » لە زۆروی بەندەری «کۆرنیتۆ» پەلاماری دەزگـایەکی تەلـەفزیۆنیان داو گرتیانە ژێر دەستی خۆیانەوە ، گەلێك کێڵگەی شەکرو لۆکەیان گرتە ژێر دەستی خۆیان ، پەلاماری چەند مەڵبـەندو بنـکەیەکی پاسەوانە گـەلی‌یە

کانێ داو تێکیان روخاندن •

هەر لەو کاتەدا لایەنی ترسریستاس چەند پەلامارێکی تازەی لە «کستاریکا» وە دەست پێکرد • چەکدارەکان کە ژمارەیان بە سەد کەس دانرابون توانی‌یان شارەکانی گرانادا ، ریواس ، پناس بلانکاس ، بگرنە ژێر دەستی خۆیان • لە شاری «گرانادا» هێزەکانی پاسەوانە گەلی‌یەکان سەریان لێ شێواو بە دیل گیران • شۆرشگێرەکان خەڵکیان کۆ ئەکردەوەو باسی تاوانەکانی ریژیمی سوموزایان بۆ ئەکردن • خەڵکی ئەو شارانە بە شێوەیەکی بێ وێنە پشتگیری‌یان لە شۆرشگێرەکان ئەکرد •

**شەڕی هەرە گەورەو خوێناوی لە راپەرینەکەی شوباتدا ، لە شاری «مونیم بۆ»(١) خەڵکی ئەو شارەو لادێکانی دەورو بەری شار بە نارنجۆکو تفەنگو تەورو ئاوی کوڵاتەوە پەلاماری پاسەوانە کانیان ئەدا • بۆ ماوەی چوار رۆژ شارەکەیان گرتە ژێر دەستی خۆیان •• پاسەوانەکان بە تۆپو هەلیکۆپتەرو تانگەوە پەلاماری شارەکەیان دا ، سەدان کەسیان لە خەڵکی شارەکە کوشت •**

هەفتەیەك دوای ئەوە سەر لە نوێ خەڵکی شارەکە پەلاماریان بردەوە سەر پاسەوانەکان • پێست سورەکانی سابتیاوا(٢) لیون . جینوتپ(٣) ، دیریامبا(٤) چەند پەلاماریکیان سازدا • بەو جۆرە چەند

(١) Monimbo.
(٢) Sabtiava.
(٣) Jinotepe.
(٤) Diriamba.

ناو چـەیەکی ژورووی رۆژ ئاوای وڵات شێوە رزگاریان لێ هـــات ٠ ٠ پاسەوانەکان تەنیا شارە گەورەکانیان بەدەستەوە مابو ٠

لە وکاتەدا وڵاتەکە لەســـە رەتای شۆرشدا بو ، خەڵــکی زۆر لێکراوی نیکاراگوا بە ئاشکرا رەخنەیان لە ریژیمی سوموزا ئەگرت ٠٠ باری سیاسی وڵاتەکـــەیان بەدڵ نـەبو ، لـــە ژورووی وڵات «دەستەی لایەنـگری شـەڕی درێژ خایەن» گـــەلێك لادێی گرتە ژێر دەستی خۆیەوە ٠ لەلای خـوارووی وڵات لایەنـکرانی ترسریستاس دەستـەو کۆمەڵی خەڵـکی زۆریان هـەبو ٠ لە شارەکانیش دەستەی پرولیتـاریا خەریکی رێکخستنی راپەڕینی کرێکارانە بو ٠ دەزگای حـاکم توانای بەڕێوە بردنی حوکمی وەکو جارانی نەمابو ٠ بۆرجوازی گرێدراو زۆر بەتوندی پارچە پارچە بو بون ، دەستەی مالی سوموزاو پاسەوانی گـەلی بەدەست ریژیمی سوموزاوە مابونەوە ٠ ئیمپریالیزمی ئەمەریکا ئەگـەر چی هیشتا یارمەتی سوموزای ئەدا بەڵام لە راگرتنی باری وڵات دودڵ بو بو ٠ ئەبوا راپەڕین لە پێناوی بەدەست گرتنی دەســەڵاتدا بەرپابێت‌و بەرپاش بو ٠

ئایا باری چۆنێتی بەرەی بۆرجوازی چۆن بو ؟ چ پرۆژەیەك بوو بە هۆی کەرتکردنی باڵە جۆربە جۆرەکانی بۆرجوازی لـــە ریژیمی گرێدراو ؟ دەوری ئیمپریالیزمی ئەمەریکا لە بارەی نیکاراگواوە چی بو؟ سیاسەتی دەرەوەی ئەمەریکا لە وزەمینەیەدا چ گۆڕینێـکی بـە سـەردا هـــات ؟ ئەمانە لە دووبەشی دوایدا بەرچاو ئەکەوون ٠

# ریفۆرمیزمی بۆرجوازی :

نیکاراگوا دوای وڵاتەکـــانی تری ئەمەریـکای ناوەند پێی نایە قۆناغی سەرمایە داری یەوە ، ئەگـەر چی ریفۆرمە لیبرالییە کـــانی سەرەتای سەدەی بیستەم کاپیتالیستی هینایە کایەوە ، لـە دوای دوەمین شەڕی جیهانی ژێر خانێکی بنچینەیی وەکو [دروستکردنی رێـگاوبان ، پۆستو تەلـگراف ، کـــارەبا ، پێــداویستی بەندەرگاکان سیستەمی مودیرنیزە کردنی بانقەکان ] •• دەستی پێکرا •

لــە گەل ئەوەشدا فراوانبونی سیستەمی سەرمایەداری نیکاراگوا لەسەر رێبازی کلاسیك وەکو سەرمایەداری ئەوروبا پێك نەهـــات • • بەڵـکو پێچەوانەی گەشە کردنی هێــزە بەرهـــەم هێنەرەکانو لەســەر ئارەزو ویستی سەرمـایە ئینحیساری یەکانی دەرەوەو بازاڕی جیهـــانی دامـــەزرا •

هەرچۆن بێت لە دوای دوەمین شەڕی جیهانیو پێك هـاتنی ژێر خانێـکی لەبار ، چاندنی لۆکـــە لــەو وڵاتە ، بە پێی ئارەزو ویستی

بازاڕەکانی جیهان پێک هات • فراوانبونی چاندنی لۆکــە بو بــە هۆی گۆڕینێکی بنچینەیی لە شێوازی کشتوکاڵی کۆندا ، وە تایبەتیە ســەد ساڵەیەکانی کشتوکاڵی لە کۆمەڵـگادا لەناو بردو ماوەی بۆ فراوانبونی بۆرجوازی گرێدراو خولقاند • تەرخان کردنی زەوی‌و زارو لەناو بردنی دەستەو کۆمەڵە کۆنەکان بو بە هۆی هاتنە کایەی پرۆلیتــاریای لادێــکان •• بەو هۆیەوە ئەو هێڵەی کە ئابوری کۆمەڵـگای کردبو بــە دو بەشەوە بۆ کۆنە پارێزەکان‌و لیبرالەکـــان لەناو برا ، ئیتر ئــەو دو لایەنە نەیان ئەتوانی ماهیەتی کۆنی خۆیان بپارێزن‌و خاسیەتەکانی چینی فەرمانڕەوا رون بکەنەوە •

هەروەهــا لە کۆتایی چلەکاندا ناکۆکی لــە ناو قەوارەی دارایی ڕیژیمی سوموزادا دەستی پێکرد کە ئیمپریالیزمی ئەمەریکا ئەیویست دەزگا بەرهەم هێنەرەکان مودیر نیزە بکات • ئەمەریکا سنوری سیاسی لەسەر سەرمــایەی دەرەوە لابردو سنوری سیاســەتی دارایی‌و ئیعتیباری گەیشتە رادەی [لیبرالیزە] لــە وڵاتدا • سیستەمی بانقــەکان گۆڕان ، بەرنامەی فراوانکردنی درێژخایەن دەست پێ کرا •

لە ساڵی ١٩٥٢ بەرهەم هێنەرەکانی لۆکە لــە ژوروی رۆژ ئاوای وڵاتدا شان بەشانی ئەوانەی قاوەیان بەرهەم ئەهێنا لەگەل بازرگانەکانی « ماناگوا » دەستەیەکی دارایی تازەیان بە ناوی [بانقی نیکاراگوا] «بانێك» دامەزراند ، لە هەمان کاتا کومپانیا بەرهەم هێنەرەکانی شەکرو هەندێك بازرگانی تر دەستەیەکی دارایی یان بە ناوی [بانقی ئەمەریکا] «بانامریکا» دامەزراند • ئەم دو دەستە داراییە تازەیە پەیوەندی یان لەگەل ســەر مایەی دەرەوەدا هەبو • هێڵێکی سەربەخۆی سیاسی یان گرتبوە بەر •

لە نیوەی یەکەمی پەنجاکاندا ئەم گۆڕانە شان بەشانی گران بونی

نرخی لۆکە لە بازاڕەکانی دەرەوەداو مانۆڕی سیاسی « تاچو سوموزا » بو بە هۆی بێ لایەن بونی ئەپۆزیسیۆنی بۆرجوازی • بەلام لە سالی ۱۹۵۵ دا نرخی قاوەو لۆکەو کەرەسە خاوەکانی تر لە بازاڕی جیهانیدا زۆر کەم بۆوە •• نرخی رادەی ئابوری لە ۳ و ۸٪ لە سالەکانی ۵۰ – ۹۵۵ بە ۳ و ۲ ٪ لە سالەکانی ۵۵ – ۹٦۰ گەیشت • گێژاوی ئابوری لەگەل کوشتنی « تاچو سوموزا » دا لە سالی ۱۹۵٦ دا چەندان هەلو مەرجی تازەی بەدی هێنا • لە سالی ۱۹۵٦ مانگرتنێکی گشتی کە لە لایەن بازرگانە کانەوە سەرپەرشتی ئەکرا کونترول کرا •

لە سەرەتای شەستەکانا ولاتە یەکگرتوەکانی ئەمەریکا گەلێك تەقەللایان دا ناکۆکی‌یەکانی دەرونی سەرمایەداری گرێدراو و دواکەوتووی ئەمەریکای ناوەند کە لە حالەتی تەقینەوەدا بو نەهێلێن •

لە کۆتایی شەستەکاندا « بازاڕی هاو بەشی ئەمەریکای ناوەند » بە هۆی چەند بیانویەکەوە ، وەکو شەڕی نێوان هیندوراس و سلفادور پەیوەندی سیاسی‌و ئابوری خۆی دۆڕاند •

لەگەل سەرەتای حەفتاکانداو زۆر بونی گیرو گرفتی سیاسی – ئابوری بۆرجوازی دژ بە سوموزا خۆیان لە رێبازو رێکخراوە کۆنەکان جیا کردەوە •

## ١ـ یەکێتی دیموکراتی ئازادیخواز (١)

دوای ئەوە ئاناستاسیو سوموزا [ تا چیتو ] لە سالی ۱۹٦۷ دا دەسەلاتی راستەو خۆ گرتە دەست ، ئەو ناکوکی‌یە ئاشکرایەی نێوان

(١) Union Democratica Deliberation - UDEL.

بەشە بۆرجوازی‌یەکان لەگەڵ دەستە دارایەکانی سەر بە سوموزا داو بۆرجوازی بیروکرات رۆژ لە دوای رۆژ قولتر بوّوە .. ریژیمی سوموزا بە حوکمی دەسەڵاتی خۆی ئیمتیازاتی سیاسی بەشەکانی بۆرجوازی مام ناوەندی دیاری کردو سنوری بۆ کێشان جگە لەوەش بەشێکی زۆری بۆرجوازی گەورەی [ کە پەیوەندی لەگەڵ بۆرجوازی بیرۆکراتو دەسەڵاتداریە کانی سۆموزادا کەمتر بو ] خستە ژێر چاودێری یەوە لە ئەنجامدا کۆنە پارێزەکانو بەشێکی گرنگی لیبرالەکان بەرامبەر بە ریژیمی سوموزا وەستان .

لە ساڵی ۱۹۷۲ دا وشکە ساڵێکی سەخت بوو بە هۆی کەمبونەوەی بەرهەمی کشتوکاڵ ، لە کۆتایی هەمان ساڵدا [ ۲۳ی ئەیلول] بومەلەرزەیەکی توند شاری «ماناگوا»ی وێران کرد کە نزیکەی پێنج یەکێکی خەڵکی نیکاراگوای تیادا ئەژیا ، هەژدە هەزار کەس تیا کوژراو سەدو حەفتا هەزاریش بێ شوێنو جێگا مانەوە .. لە ۹۰٪ی شوێنە بازرگانی‌یەکانی شاری ماناگوای لەگەڵ خاکدا یەکسان کرد .

بۆ یارمەتیدانی زیان لێ کەوتووەکانی بومەلەرزە لە دەرەوەی وڵات [ ۲۵۰ ملیۆن دۆلار ] یارمەتی درا بە نیکاراگوا ئەو یارمەتیانەی کە بڕیار بو شارەکەی پێ ئاوەدان بکرێتەوەو بدرێت بە زیان لێ کەوتووەکان هەموی چووە گیرفانی بنەماڵەی سوموزاو ئەفسەرە گەورەکانی پاسەوانی گەلو دەستەو دایەرەکانیان . سوموزا بواری بازرگانێتی خۆی فراوانتر کرد . فەسادی ئیداری بە تەواوی زۆر بو ، داخوازیو ئارەزوی خەڵك رۆژ بە رۆژ ئەبوکایەوە .

گێژاوی سیستەمی سەرمایەداری جیهانی کە لە کۆتایی ساڵی ۱۹۷۳ دا دەستی پێکرد کارێکی زۆری کردە سەر نیکاراگوا . دەوڵەت

دەستی کرد بە زۆر کردنی باج لەسەر خەڵكو بڵاو کردنەوەی سەنەدی قەرزو قۆڵەی دەوڵەتی •• ئەمانە هەموو خەڵکیان زۆر تر بێزار ئەکرد •

نیکاراگوا کەوتبوە ناو گێژاوێکی قوڵی ئابوری‌یەوە ، پایەکـــانی ڕیژیمی سوموزا هاتبونە لەرزین • بۆرجوازی‌یەکانی دژ بـــە سوموزا خەریکی خۆ ڕێکخستن بون •

لـــە ۲۷ی مانگی ئەیلولی ساڵی ۱۹۷٤ دا بـــەرەی ئازادیخـــوازی گـــەلی ســـاندینیستا پەلامـــاری میوانداری‌یەکی کریسمی یان داو ژمـــارەیەك لـــە سیاسەتمەدارە بەرز پایەکانو ئەندامـــانی بنەمـــاڵەی ســـوموزایان بەدیلو بارمتە گرت ، بەرامبـــەر بـــە بەرڵلا کردنی چەند زیندانیەکی سیاسیو ملیۆنێك دۆلار سوموزا ناچار بو قبوڵی کرد •

ئەمکارە لە کاتێکدا بو کە هەمو کۆمەڵانی خەڵك خۆیان بۆ شۆرش گورج کردبۆوە ، ئەپۆزیسیونی بۆرجوازی ئەمـــەیان زانی : ئەگـــەر بۆرجوازی نەتوانێت «ئالترناتیو» ێك بێنێت ئـــەوا هێزە شورشگێڕەکان رابەری ئەو راپەڕینە ئەگرنە دەست خۆیان •

یەکێك لەو ئالتر ناتیویانە لە هەمان مانگدا دامەزرا ، پدرو شامورو(۱) سەر نوسەری رۆژ نامەی «لاپرنسا»(۲) کە یەکێك بوو لەوانەی رەخنـــەی لـــە سوموزا ئەگـــرت [یەکێتی دیموکـــراتی ئازادیخوازی «یودل» ی دامەزراند ] •• یەکێتی ناوبراو هەر لە سەرەتای دامەزراندنیەوە بە پێی

(۱) Pedrochamorro:

(۲) Leprensa .

بەرنامەی کاری خۆی کە داوای ریفۆرمی پێشکەوتوانەی ئەکرد وەکو :
ریفۆرمی زەوی‌و زار ، مافی چارەنوسی گەل ، ئازادی هەڵبژاردن و ...
هێزێکی لە نێوان خۆی‌و ئەپۆزیسیۆنی کۆنە پارێزاندا کێشا .. یودل
طیف چەند دەستەو کۆمەڵێکی سیاسی دژ بە سوموزای لە ناو یەکێتی
کرێکاراندا کۆ کردەوە .

رێکخراوە سیاسی‌یەکانی ناو دەرونی یودل بریتی بون لە چەند
بەشێکی تایبەتی بۆرجوازی کە لەوەبەر سەر بە دەستە دارایەکەی
سوموزا بون ، وەکو «رامیروساکاسا»(١) ، رێکخراوە کۆنە
بۆرجوازی‌یەکان ، حزبی سوشیالیستی نیکاراگوا . یودل خۆی بە هەوێنی
پەیوەندی چەند چینێکی کۆمەلایەتی دائەنا ، کە نوێنەری نێوان کارو
سەرمایە بو . لە کاتێکدا کە چەند توێژێکی بۆرجوازی گرێدراو لەناو
یەکێتی یەکەی یودل‌دا بون . عونسورە دەست بەکارەکانی ئەم رێکخراوە
بۆرجوازی نیشتمانی‌و وردە بۆرجوازی لادێکانی نیکاراگوا بون ..
ئەمە مانای ئەوە نیە لەگەل ئەوەشدا هەندێك لە رابەرە دەرکەوتوەکانی
یودل لە بورجوازی‌یە گرێدراوەکانن کە سەنەدو مامەڵەی نزیکیان
لەگەل سەرمایەی دەرەوەدا هەیە ..

یودل لە روی سیاسی‌یەوە هەوڵی ئەوەی ئەدا ئەو هێزانەی لە
دەوری کۆبونەتەوە دژی سوموزا رایان پەرێنی‌و رێکیان بخات .. جگە
لە دژایەتی کردنی سوموزا ئیتر هیچ بەرنامەیەکی بۆ دوا رۆژی وڵاتی
نیکاراگوا بە دەستەوە نەبو .

بەرنامەی کاری یودڵ لە بەرنامەی ئەپۆزیسیونی کۆنی بۆرجوازی

---

Ramiro Sacasa.

پێشکەوتوانە تر بو ، چونکە ئەوان تەنیا بۆ ئەوە کاریان ئەکرد کە لە هەڵبژاردن‌دا سەرکەوتوبن • بەڵام یودل داوای دیموکراتیزە کردنی کومەڵ ، هەڵبژاردنی ئازاد ، سەر لە نوێ هەڵبژاردنەوەی سەرکۆمار ، فراوانبونی ئابوری ، ریفورمی زەوی‌و زار ، ریفورمی دارایی ، مافی مانگرتن ، دانانی یاسای کۆمەڵایەتی لە بارەی تەندروستی‌یەوە ، زانست‌و پەروەردە کردن ، مافی حاکمیەتی گەل ، سەربەخۆیی دیپلوماسی‌و ••• ئەکرد بەڵام ئەپۆزیسیۆنی وەفادار واتا بۆرجوازی کۆمپرادۆر لە بەرنامەی یودڵ پێشکەوتوانە تر بون •

هەرچۆن بێت پێویستە ئەوە رون بکرێتەوە کە یەکێتی هێزەکانی دەرونی یودڵ یەکێتی یەکی کاتی بوو ، کە لەگەل لەناو چونی دیکتاتۆری سوموزاد ئەوانیش هەمو لێك هەڵ ئەوەشانەوە •

تاقیکردنەوە مێژوییەکانی جیهان‌و نیکاراگوا ئەوەیان دەرخستووە کە ستراتیجی یودل هەرگیز ناتوانێت ریژیمی سوموزا لەناو ببات ، یودل تەنیا لە رۆژنامە کانا سەرزەنشتی دەسەڵاتی سوموزای ئەکرد ئیتر هیچ هێزێکی چەکداری بە دەستەوە نەبو •

هەرچەند ماوەی چل ساڵ وڵاتە یەکگرتوەکانی ئەمەریکا پشتگیری‌یان لە سوموزا کرد ، بەڵام لەناوچونی سوموزا نوشوستی یەکی مێژویی بو ، بۆ ئەمەریکا •

ئەمەریکا بە باشی ئەوەی ئەزانی کە ریژیمی سوموزا [ لاواز ترین ئەڵقەیە ] لە زنجیرەی وڵاتەکانی ئەمەریکای ناوەندا ، دەولەتێکی لە جۆری یودل ئەتوانێت هەندێك لە ناکۆکی‌یەکانی ناو خۆی نیکاراگوا

بەشێوەیەکی کاتی چارەسەر بـــکات •• بەرنامەی کـــاری یودل هیچ خێکی وەهای تیا نەبو کە مەترسی بخاتە دڵی ئەمەریکاوە •

بیروڕای یودل بەرامبەر بە بەرەی ساندینیستا شتێــکی نادیار بو ، پدرو شامارو ، رابەری یودل ، زۆر هەوڵی دا ئەمەریکا کارکەنار بکات• کە یەکیتی یەکی دیموکراتی ئالتر ناتیوی نا شۆرشگێرانە بۆ جێ نشینی سوموزا پێك بێنێت • ئەم کـــارە بە نیسبەت ئەمەریکاوە خراپ نەبو •• شامورو بە هیوا بو کە بە پشتیوانی ئەمەریکا خۆی بۆ سەرکۆماری ساڵی ١٩٨١ هەڵبژێرێت ••

## ٢ـ حزبی سوشیالیستی نیکاراگوا (*)

حزبی سوشیالیستی نیکاراگوا بە شێوەی رەسمی لە ساڵی ١٩٤٤ دامەزرا ، بە گورجی توانی رەگ‌و ریشە لەناو کرێکارانی نیکاراگوا داکوتێ‌و بۆ لای خۆی رایان بکێشێ •• حزبی سوشیالیستی نیکاراگوا نەیتوانی ناکوکی‌یە گشتی‌یەکانی جیهـــان ببەستێت بـە ناکوکی‌یەکانی ناوخۆی نیکاراگواوە •• بە تایبەتی لە کاتێکدا کە هەمو جیهـــان لـــە سەردەمی گۆڕانێکی قوڵدا بو •• یان بەرنامەیەکی سیاسی ئاشکرا بۆ خۆی دیاری بـکات • لە لایەکی ترەوە لەناو خۆی نیکاراگوادا ئەوانەی دژی سوموزا بون کۆنە پارێزەکان رابەری‌یان ئەکردن • حزبی سوشیالیست لەبەر ئەو هۆیانەی لـە سەرەوە باسکران لە ساڵەکـــانی ٤٤ـ١٩٤٧ دا سیاسەتی پاراستنی سوموزای گرتە بەر •

ریژیمی سوموزای یەکەم لەبەر زۆر بۆ هێنانی لە لایەن خەڵکەوە ،

---

(*) P S N

حزبی سوشیالیستی بە رەسمی ناساند .. حزبی سوشیالیست سودی لەم هەلە وەرگرت‌و دەستی کرد بە ڕێکخستنی فیدراسیۆنی کرێکاران‌و لەناو کرێکاراندا چەندان یەکێتی دامەزراند . سوموزا لە لایەکەوە بۆ ئەوەی زۆر بۆ بۆرجوازی‌یە ناحەزەکانی بێنێ‌و لە لایەکی تریشەوە وەڵامی کۆمەڵانی خەڵك بداتەوەو سەرنجی حزبی سوشیالیست بۆ لای خۆی رابکێشێ یاسایەکی کار کردنی دانا کە لە چاو ئەو رۆژەی ئەمەریکای ناوەندا کارێکی پێشکەو توانە بو ..

لە ساڵی ١٩٤٦ تاچو سوموزا لەبەر زۆری خەڵك خۆی لە هەڵبژاردن دور خستەوە ، هاوڕێیەکی خۆی کەناوی «لیوناردو ئارگویلو» بو کردی بە سەرکۆمار .. دوای ئەوە ئارگویلو دەربارەی سوموزا سیاسەتێکی سەربەخۆو بێ لایەنیانەی گرتە بەر حزبی سوشیالیست هاریکاری لەگەلدا کرد . سوموزا کودتایەکی بەسەردا کردو خۆی بو بە سەرکۆمارو کەوتە وێزەی راپەڕینی کرێکاران‌و حزبی سوشیالیست‌و گەلێك لە رابەرو کادیرەکانی گرتن‌و ژمارەیەکیشی لێ کوشتن .. لەو کاتەوە ئیتر حزبی سوشیالیست بەرەو لاوازی رۆیشت .

کە راپەڕینی چەکدارانەی بەرەی ئازادیخوازی گەلی ساندینیستا دەستی پێکرد ، بە تایبەتی کە لە کۆتایی شەستەکاندا پەرەی سەندبو .. حزبی سوشیالیست خۆی بە پێشرەوی کرێکاران ئەزانی ئەو راپەڕینەی بە ئاژاوە لە قەڵەم دا .. گیرۆدەی ئاڵۆزی‌و گێژاوی سیاسی بو . هەندێك لە کادیرە لاوەکان پشتگیری راپەڕینەکەیان ئەکرد . تەنانەت هەندێکیان لە حزب جیا بونەوەو چونە ناو راپەڕینەکەوە .

گێژاوی ناوخۆی حزب هەمو لایەنێکی حزبی گرتەوە ، لە ساڵی ١٩٦٧ دا بو بە هۆی دەرکردنی

رابەرە کۆنەکانی حزب کـە دژی راپەڕینەکە بون •
هەروەها رابەرە تازەکان لەگەل ئەوەدا کە بە ئاشـکرا
باسی راپەڕینەکەیان ئەکرد ، لـــە کرداردا ئاشـتی
پەرست بون •

لە ساڵی ١٩٧٤ دا حزبی سوشیالیست چووە ناو «یەکێتی دیموکراتی ئازادیخواز »ەوە و بە رەخنە گرتن لە ساندینیستا سیاسەتی خۆی ئاشکرا کرد • لە دوای چالاکی‌یەکانی ساندینیستا لـــە ئـەیلولی ١٩٧٤ دا ، حزبی سوشیالیست ئەم چالاکی‌یانەی بـــە ئاژاوە گێڕانو کـاری دور لە کۆمەلانی خەڵكو ماڵوێرانی هێنان بۆ خەڵکی نیکاراگوا دانا •

حزبی سوشیالیست نەك تەنیـــا نەیتوانی دەسەلاتی خۆی بەسـەر « یەکێتـــی دیموکراتی »دا بســـەپێنێ بەڵـکو لـــە ژێـــر دروشمی بۆرجوازی‌یەکانا کاری ئەکرد •

بێگومان ولاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا لەم رووەوە بیروڕایەکی تریان هەبو ، دەسەلاتە رەسمی‌یەکانی ئەمەریکا لەو باوەڕەدا بون کۆنـە پارێزانی ناو دەرونی یودل رێکخستنێکی رێكو پێکیان نیـە، بونی حـزبی سوشیالیست لە «یەکێتی دیموکراتی» دا مەترسی هێنانەدی هەلو مـەرجی وەکو پورتوگال دێنێتە کـــایەوە •• لەبەر ئـــەوە دەستەو دایـــەرەی باڵوێزخـــانەی ئەمەریـــکا زۆر هـــەوڵیان دا حزبی سوشیالیست لەناو یەکێتی‌یەکەدا دور بخەنەوە •

حزبی سوشیالیست ئێستا لەناو کرێکارانو یەکێتی‌یەکانی کرێکاراندا پایەیەکی پتەوی هەیە • لە هەمان کاتدا ئەو کرێکارانەی لایەنگری حزبن بریتین لە توێژەکانی سەرەوەی چینی کرێکارو رابەرانی یەکێتی‌یەکانو سنعەتکارە بچوکەکان •

## ٣ـ دەستەی دوازدە کەسی

لە مانگی کانونی‌یەکەمی ساڵی ١٩٧٧ دا هەندێك لە بازرگانە ئیشکەرەکانو پیاوە ئاینیو رۆشنبیرەکان کە زۆر تر پەیوەندی یان بە بەرەی ساندینیستاوە بو کۆمەڵێکیان دروست کرد کە بە دەستەی دوازدە کەسی ناو ئەبران • ئەم دەستەیە پێچەوانەی یەکێتی دیموکراتی ئازادیخواز، لەو باوەڕەدا بون کە تەنیا راپەڕینی چەکدارانە ئەتوانێت سوموزا ناچار بکات واز لە دەسەڵاتەکەی بهێنێ •• ئەم دەستەیە لە هەوڵی ئەوەدا بون یەکێتی یەکی تاکتیکی بە پێی بەرنامەیەکی سیاسی لەگەل یەکێك لەو دەستەیەی ناو بەرەی ساندینیستا دروست بکەن •• ئەمانە بڵاویان کردەوە کە دەوڵەتێکی خەڵکی لەگەل چەکدارە ساندینیستەکاندا تەنیا رێگایە بۆ چارەسەر کردنی گێژاوەکەی نیکاراگوا • ئیتر هیچ رێگایەکی تری چارەسەریانە خۆی راناگرێتو ناتوانێ داخوازیە کانی خەڵکی نیکاراگوا جێبەجێ بکات •

ئەو روداوانەی کە لە نیکاراگوادا رویان ئەدا پایەو پلەی دەستەی دوازدە کەسی بەهێز تر ئەکرد ، یەکێتی دیموکراتی کە توانیبووی سەرنجی کلیسای کاثۆلیكو بەشێکی تر لە بۆرجوازی‌یەکان بۆ لای خۆی رابکێشێو هەروەها هیوای بە ئەمەریکاش هەبو • لە بارەی دەسەڵاتەوە داوای دیالوگێکی گەلی ئەکرد بۆ سەر لەنوێ دامەزراندنەوەی دەسەڵاتی سیاسی ، لەو کاتەشدا بەرەی ساندینیستا پەلامارێکی تازەی بردە سەر هێزەکانی پاسەوانە گەلی‌یەکان •• لەو کاتەدا پدرو شامورو ، رابەری یودل چو بۆ وڵاتە یەکگرتووەکان بۆ ئەوەی ئەمەریکا زامنی بکات کە سوموزا لەسەر کار لابات • بەڵام کاتێك شامورو گەڕایەوە بۆ نیکاراگوا لە رۆژی ١٠ی کانونی‌دوەمی ساڵی

١٩٧٨ دا له لایەن کرێگرتەکانی سوموزاوە کوژرا • ئەم تاوانە بو بە هۆی توڕەبونی خەڵك لە هەمو شارەکاندا ، بە دەیان هەزار کەس لە شاری ماناگوا رژانە سەر شەقامەکان پشتیوانی بەرەی ساندینیستایان ئەکردو داوای کۆتایی هێنانی زنجیرەی دەسەڵاتداریتی سۆموزایان ئەکرد • بەرامبەر بەم کارە «یەکێتی دیموکراتی ئازادیخواز»و ئەپۆزیسیونی بۆرجوازی دەستیان کرد بە کار کردنی سیاسیانەی دولایەنی تاکو نەهێڵن راپەڕینی کۆمەلانی خەڵك بچیتە ژێر رکێفی ساندینیستاوە • لە رۆژی ٢٣ی کانونی‌دوەمدا یودل مانگرتنێکی گشتی سەرەوالای راگەیاند ، دوا بە دوای ئەوە بەشێکی زۆر چالاکی ئابوری راوەستا •• بۆرجوازی نیکاراگوا بۆ بەرگرتن لە راپەڕینی شۆرشگێرانەی کرێکارانو بەدەست هێنانی رابەری راپەڕینەکەیان رایگەیاند بەشێك لە داخوازی‌یەکانیان جێ‌بەجێ ئەکات •

لەگەل ئەم گۆڕانکاری‌یانەدا ، یودل بەرامبەر بە سوموزا هەڵوێستێکی تری گرتە بەر لە جیاتی داوا کردنی [دیالوگی گەلی] داوای لەسەر کار لاچونی سوموزای ئەکرد ، وە داوای لە خەڵك کرد خۆیان بۆ شەڕی تەواوی لەگەل سوموزادا ئامادە بکەن •

سوموزا بۆ ئەوەی هەمو مانۆڕەکانی ئەپۆزیسیون پوچ بکاتەوە دەستی کرد بە جێ‌بەجێ کردنی چەند کارێکی تازەو رایگەیاند کە هەڵبژاردنی شارەوانی‌یەکان دەست پێ بکات ، داوای لە هەمو رێکخراوەکان کرد بە ئازادی بەشداری ئەم هەڵبژاردنانە بکەن • بەلام گێژاو بە جۆرێك ولاتی داگرتبو کە تەنانەت بۆرجوازی‌یە راستڕەوەکانیش بەشداری هەڵبژاردنەکەیان نەکرد •

لــــه دوەمین ڕۆژی مانــگی شوباتی ســاڵی ١٩٧٨ دا چەکــدارە ساندینیستەکان پەلاماری چوار شاری نیکاراگوایان دا • ئەگەرچی لــەم پەلامار دانانەدا سەر نەکەوتن بەڵام بو بـــە هـــۆی زیاتر ڕێکخستنی خەڵــکەکە •

پەلامار بردنی چەکدارە ساندینیستەکانو کەمتوانایی یودل لــەبەر گیری کردنی ڕاپەڕینی کۆمەڵانی خەڵــکدا ، ئەمەریکای جارێــکی تر کردەوە بە دۆستی سوموزا • ئیمپریالیزمی ئەمەریکا بـــە یارمەتیــدانی تازەی سوموزا ئەوەی دەرخست کە دەست بەرداری سوموزا نابێت •

دەســتەی دوازدە کـــەسی ، رادیــکالترین دیاردەی ناوخـــۆی بۆرجوازی بو ، بەرنامەکـــەیان لەگەل بەرنامـــــەی چەپی‌یەکانی ناو « یەکێتی دیموکراتی ئازادیخواز » دا بە یەك نزیك بون • لــەبەر ئــەوە ئەو دەستەیە توانی‌یان لە سەرەتای دامەزراندنیانەوە ڕۆڵێکی گەورە لـــە بواری گۆڕینی سیاسی نیکاراگوادا بگێڕن •

## ٤ـ ڕاپەڕینی دیموکراتیانەی نیکاراگوا (*)

هەروەکو لەمەوبەر باسکرا جگەلە دەستەی ئابوری سوموزا ، دو دەستەی ئابوری تر لە نیکاراگوادا هــەبو ، یەکێکیان [بانقی ئەمەریــکا]و ئەویتریان [ بانقی نیکاراگوا ] ، بە زۆری خاوەن سنعەتە گەورەکـــان لەگەل یەکێك لەم سێ دەستەیە پەیوەندیدار بون • ئەوانە سەرجـــەم گەورە ترین بەشی بۆرجوازی تایبـــەتی ئینجیساری نیــکاراگوا بون • لەگەل سوموزادا پەیوەندیەکی بەتینی ئابوری‌یان هەبوو ، هەرگیز نەیان

* Nicaraguoan Democratic Movement—NDM.

ئەویست بارو دۆخی ئابوری وڵات بگۆڕێت •• بەرنامەکانی یودل یان بە چەپڕەوی دائەنا •

شایانی باسکردنە ئەو دو دەستە ئابوری‌یەی لە سەرەوە باسکران لە ماوەی شەستەکاندا پەیوەندی یان لەگەڵ بازاڕی هاوبەشی ئەمەریکای ناوەند لە لایەکەوەو پەیوەندی‌یان لەگەڵ سەرمایە ئەمەریکایەکانی تر لە لایەکی ترەوە هەبو •

لە ساڵی ١٩٧٥ دا بورجوازی گەورە هێشتا بەوە قایل نەبو کە لەوانەیە ئیتر ئەمەریکا پشتگیری لە سوموزا نەکات ، بە تایبەتی لە کاتێکدا پاسەوانە گەلی‌یەکان ئەیانتوانی چەکدارەکان سەرکوت بکەن •

بانقی ئەمەریکاو بانقی نیکاراگواو هێزە گرێدراوەکانی تر لە مانگرتنی گشتی ٢٣ی کانونی‌دوەمدا کە لە لایەن «یودل» ەوە ساز کرابو ، بەشداری‌یان نەکرد • هەروەها پەیوەندی بازرگانی‌و سیاسی خۆیان لەگەڵ سوموزادا درێژە پێدا •

بۆرجوازی مالی رایانگەیاند کە یودل‌و دەستەی دوازدە کەسی ناتوانن رابەری راپەڕینەکە بکەن • هەروەها رێکخراوەکانی تریش لاوازو بێ هێزن •

لەبەر ئەوە بۆرجوازی مالی کەوتنە خۆ بۆ ئەوەی ئالترناتیوی خۆیان پێك بهێنن • لە مانگی مارسی ١٩٧٨ دا « راپەڕینی دیموکراتیانەی نیکاراگوا » دامەزرا ، یەکێك لە سەرمایەدارە ناسراوەکانی نیکاراگوا کە پەیوەندی یەکی بە هێزی لەگەڵ بانقی نیکاراگوادا هەبو ، ناوی «ئەلفونسو روبلو کالەجاس»(١) بو ، رابەری

(١) Alfonso Robelo Callejas.

ئەو دەستە تازەیەی ئەکرد •

راپەرینی دیموکراتی بەهیوا بو باڵە راستەکـەی ناو یودل بۆ لای خۆی رابکێشێ • راپەرینی دیموکراتی هەر لە سەرەتای پێك هـاتنیەوە دوچاری ئەو ناکۆکی‌یە دەرونیانە بو کـە یودڵو هـەمو ئەپۆزیسیونی بۆرجوازی دوچـاری بوبون •• راپەرینی شۆرشگێرانەی نیکاراگواو گێژاوی شۆرشگێرانە زیاد لەو رادەیە گەشەیان کردبو کە داوای کەمتر لە لابردنی سوموزا بـکەن •

## ٥ـ بەرەی فراوانی ئەپۆزیسێون

لە مانگی مایسی ساڵی ١٩٧٨ دا دەستەیەکی تازە دامەزرا بـە ناوی «بەرەی فراوانی ئەپۆزیسۆن»(١) ، کـە ئامـانجی دامـەزراندنی ئالتر ناتیۆی بۆرجوازی بو کە هەم بۆ وڵاتە یەکگرتووەکانو هـەم بۆ هەریەك لەو سێ دەستەیەی ناو بەرەی ئازادیخوازی گـەلی ساندینیستا زیانۆمەند نەبو • راپەرینی دیموکراتی نیـکاراگوا ، دەستەی دوازدە کەسیو کۆنفیدراسیۆنەکانی کرێکارانو رێکخراوە رەخنە گرە کانی تر لەژێر چەتری ئەم دەستە بەندی‌یە تازەدا کۆ بونەوە •

بەرەی فراوانی ئەپۆزیسێون لـە مانـگی کانونی‌یەکەمی ١٩٧٨ دا کۆمیسیۆنێکی سێ کەسی یان پێك هێنا بۆ گفتوگۆ کردنی ناوبژیکارانە کـە رێکخراوی وڵاتە ئەمەریکایەکان سازیان دابو • ئـەم گفتوگۆیانە بەهۆی پێ داگرتنی ئەمەریـکاوە لـە بارەی بەشداری کردنی حزبی لیبرالی سوموزاوە لە دەوڵەتی ئایندەدا دوچاری نوشوستی بو ، دەسـتەی دوازدە کـەسیو حـزبی سوشیالیستو یەکێك لـە کۆنفیدراسیۆنە

(١) Brodaoppostion Front.

کرێکاری یەکان لە گفتوگۆکان چونە دەرەوە •

ئەمرۆکە دەر ئەکەوێ ئـەم بەرەیە دوچـاری نوشوستی بووە(١) ، ئەمەریکا بە کارێکی ناشیاوی دائەنێ‌و لەو باوەڕەدا نیـــە دوای سوموزا بتوانێت ئەو کەلەبەرە سیاسی یە پڕ بکاتەوە •

لەم کاتەدا(٢) ، ولاتە یەکگرتووەکان ئەگەرچی قایل‌بو بە لابردنی سوموزا ، بەلام بنچینەی سیاسەتی ولاتی ئەدایە دەست باڵـە راستەکـەی بۆرجوازی بەو مەرجەی حزبی لیبرالی سوموزا بەشداری دەوڵەت بکات‌و پاسەوانە گەلی‌یەکان دەســـەلاتیان لە دەوڵەت دا بمێنێتەوەو دەسەلاتی ئابوری بنەماڵەی سوموزاش دەستی لێ نەدرێ •

بورجوازی نیشتمانی نیکاراگوا کـە بە هۆی ئیمپریالیزمەوە لـــە بواری مێژوویدا لاواز بوبو ، لە ئەنجامدا ناچار بو رابەری لە دەرەوەی هوردوگای خۆی قبوڵ بکات •• یان ئەوەتە پاڵ بدات بە ئیمپریالیزمەوەو لەژێر دەسەلاتی بۆرجوازی گرێدراوو پاسەوانە گەلی‌یەکانا بمێنێتەوە•• یان رابەرایەتی ساندینیستا لەناو دەوڵەتێکی خەڵـــکی دا قبوڵ بـکات • وەکو ئەکەوێتە بەرچاو بۆرجوازی بە زۆری ئەچونە ناو چەکـدارە شورشگێڕەکانەوە •



---

(١) مەبەست کاتی نوسینی کتێبەکەیە •
(٢) هەمان مەبەستی سەرەوە ـوەرگێڕ •

# ستراتیجی ئەمەریکا لە نیکاراگوا

ئەگەرچی ئیمپریالیزمی ئەمەریکا لە کاتی راپەڕینی ئازادیخوازانەی گەلیدا لە سیەکاندا ناچار بو هێزە سەربازییەکانی خۆی [ بێ ئەوەی بتوانێت لەشکری چەکداری ساندینو تێك بشکێنێ ] لە نیکاراگوا بباتە دەرەوە • ئیمپریالیزمی ئەمەریکا بۆ ئەوەی ریژیمی موستەعمەراتی نوێ دابمەزرێنێت سیاسەتی دەستێوەردانی رۆژانەی درێژ خایەنی لە کاروباری ولاتدا گرتە بەر •

پاراستنی بنەماڵەی سوموزا لە لایەن ئەمەریکاوە لە ماوەی نیو سەدەی رابوردودا بو بو بە هێڵی بنچینەیی سیاسەتی دەروەی ئەمەریکا لە کاروباری ولاتی نیکاراگوادا • لە هەمو کاتو سەردەمێکی ئاڵۆزدا یارمەتیو پشتگیری خۆی لە بنەماڵەی سوموزا نەبڕی •

لە سەردەمی دوەمین شەڕی جیهانیدا گەورە ترین مەترسی کە هەڕەشەی لە ئیمپریالیزمی ئەمەریکا ئەکرد ، فاشیزمی ئیتالیاییو نازیزمی ئەڵەمانی بو • سوموزا لەگەل ئەوەدا پەیوەندی لەگەل موسولینیو هیتلەر

دا هەبو [ لە ساڵی ١٩٣٦ دا بە فەرمانی فاشیستەکان دەستەو کۆمەڵی « کراسە رەشەکان »ی لە نیکاراگوا دامەزراند ] •• لەگەل ئەوەدا دو رۆژ دوای ئەوە ئەمەریکا تێکەڵاوی شەڕەکە بو لە دژی ژاپۆن و ئەڵەمان • ئەگەرچی لەشکری نیکاراگوا هیچ چالاکی یەکی روبەرویی لەگەل هێزە سوێند خوارەکانا نەنواند بەڵام سوموزا توانی رادەیەکی تەواو کەرەستەی سەربازی بە پێی [بڕیار نامەی قەرزو قۆڵە ] وە لە ئەمەریکا وەر بگرێ •

لە دوای شەڕەکە ، ئیمپریالیزمی ئەمەریکا کە مەینەتی کەمتری چەشتبوو ، توانی خۆی بە سەرکردەی وڵاتە ئیمپریالیستیەکان دابنێت لە شەڕەکەدا • لەو کاتەدا راپەڕینی ئازادیخوازانەو پرۆلیتاریایی مەترسی‌یەکی گەورەی بۆ جیهانی ئیمپریالیستی نابۆوە •• لە ئەمەریکای لاتین دا خەڵکە زۆر لێکراوەکان راپەڕینی تازەی دژی ئیمپریالیزمیان تاقی ئەکردەوە • لە زوربەی وڵاتاندا هێزە پێشکەوتنخوازەکان بە تیژی ئەچون بەگژ سیاسەتی زۆرە ملی‌یانەی ئیمپریالیزمدا •

لەو کاتانەدا ئیمپریالیزمی ئەمریکا بۆ ئەوەی دەسەڵاتی خۆی بچەسپێنێ بەسەر ئەمەریکای لاتین‌و بەرگیری لە راپەڕینی ئازادیخوازانەی گەل‌و پرۆلیتاریایی بگرێ گەلێك چالاکی نواند • لەم روەوە کۆنفرانسێك لە وڵاتەکانی ئەمەریکای لاتین لە «مەکسیك» بەسترا بۆ ئەوەی سیاسەتی تازەی «پان ئەمریکان»ی وڵاتە یەکگرتووەکان جێ‌بەجێ بکەن •

تاچو سوموزا بە گورجی چو بە پیر سیاسەتی دەرەوەی ئەمەریکاوەو پێشنیاری کرد کە نیکاراگوا وەکو قەڵایەکی دژ بە شۆرشگێڕان‌و راپەڕینی دژی ئیمپریالیستی تەماشا بکەن‌و بەهێزی بکەن•

سوموزا تەقەللای ئەوەی ئەدا بنەماڵەکەی خۆی وەکو سەگی پاسەوانی ئیمپریالیزمی ئەمەریکا لە ناوچەکەدا بەهێز بکاتو لەم ڕێگایەوە درێژە بە مانەوەی حکومەتەکەی بدات .

## ١ـ ئەهمیەتی نیکاراگوا بۆ ئیمپریالیزمی ئەمەریکا

پشتگیری ئەمەریکا بۆ ڕیژیمی سوموزاو پەیوەندی سوموزا لەگەل هەمو سیاسەتی وڵاتە یەکگرتووەکان لە ئەمەریـــکای لاتین‌دا ، ئەبوا ئەمەریکا قازانجی تایبەتی وڵاتی نیکاراگوای بدابایەتە بەر سەرنج .

سیاسەتمەدارانی ئەمەریکایی وایان لێك ئەدایەوە کە هەریەك لـە وڵاتانی زنجیرەی ئەمەریکای ناوەند لە دەست بچێ کارێکی مـەترسی دارانەیەو هەڕەشە لە ئیمپریالیزمی ئەمەریـــکا ئەکات . زوربەی ئـەم وڵاتانە دەستیان بە دەریای «کاریبی»و ئۆقیانوسی ئارام ئەگات ، لەبـەر ئەوە ئەتوانن سیستەمی ئاسایشی ناوچەیی کە لە سەر بنچینەی قـازانجی بۆرجوازی خـــاوەن دەزگـــا ئینجیساری‌یەکان دامەزراوە بخـــەنە مەترسی‌یەوە ..

لەم ڕووەوە دۆڕاندنی نیکاراگوا بۆ وڵاتە یەکگرتوەکانی ئەمەریکا وەکو دۆڕاندنی تەواوی ئەمەریکای ناوەند وەهایە . نیکاراگوا ، وەکو ڤیتنام لـە خوارووی ڕۆژهەڵاتی ئاسیادا ڕۆڵێکی گەورە لـە سەرتاسەری ناوچەکەدا ئەگێڕێ ، ئیمپریالیزمی ئەمەریکا نایەوێ لە دەستی بچێت .. لەم ڕووەوە ئامانجی ئەمەریکا لـــە نیکاراگوادا بە زۆری ئەوەیە کە بەرهەڵستی شۆڕش‌و

راپەڕینی چینایەتی لەو وڵاتانەدا بووەستێ ، چونکە ئەگەر ئەم کارانە رو بدەن ئەوا کارێکی پڕ لە مەترسی دارە بۆ تەواوی ئەمەریکای ناوەند ..

هەروەها شوێنو ستراتیجێتی نیکاراگوا لە کاتی دوەمین جەنگی جیهانیدا بەهۆی هەڵکەوتنی باری جوگرافیاییەوە روڵێکی ستراتیجی گەورەی بۆ ئیمپریالیزمی ئەمەریکا دیاری کردبو . ئەم وڵاتە بوبو بە بنکەیەکی پاراستنی نوکەندی «پاناما»و ئامادە کردنی کەرەسەی خاوی پیشە سازی جەنگی ئەمەریکا .. لە دوای شەڕەکەش ئەو ئەهمیەتەی کەم بۆوە .

مەسەلەیەکی تر کە لە سەردەمی رابوردودا ئەهمیەتێکی زۆری بۆ ئیمپریالیزمی ئەمەریکا هەبو ، دروستکردنی نۆکەندێکی ئاوی بو لە نیکاراگوا کە دەریای «کاریبی» بە ئوقیانوسی ئارامەوە ببەستێ . وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا لە سەدەی نۆزدەیەمدا لە هەوڵی هەڵکەندنی ئەو نۆکەندەدا بون ، ئەم مەسەلەیە تەنانەت دوای تەواو کردنی نۆکەندی «پاناما» ئەهمیەتی خۆی نەدۆڕاند .

لە ساڵی ١٩١٤ وڵاتە یەکگرتوەکان توانی بە هۆی پەیمانی « بریان ـ شامورو » وە مافی ئینحیساری دروستکردنی نۆکەند لە نیکاراگوا بە دەست بێنێ .. لە دوای دوەمین شەڕی جیهانی چەندان گفتوگۆ لە بارەی ئەو نۆکەندەوە کرا ، بەڵام نەئەگەیشتنە ئەنجام .

لە سەرەتای شەستەکانا ، بە تایبەتی لە دوای راپەڕینی دژی ئەمەیکایی «پاناما» لە ساڵی ١٩٦٤ دا ، هەندێك لە ئەندامانی کونگریسی ئەمەریکا بە سەروکایەتی «دانیل فلود» نوێنەری دیموکرات لە نپسیلوانیا

سەر لەنوێ باسی نۆکەندی نیکاراگوایان هێنایەوە بەر باسکردن • ئـەم کارە لە نیکاراگوا دەنگێکی گـەورەی دایـەوە ، خەڵـکی بێزاری‌یەکی زۆریان دەربڕی چونـــکە ئەم ڕێــکەوتنەی بریان ـ شامورو یان بە پێچـەوانەی یاسای بنچینەیی‌و مـــافی حاکمیەتی نیشتمانی ئەزانی • تا ئەیشتە ئەو رادەیە شورای یاسا گوزاری ناچـار بو لە لایەن دەوڵەتەوە ئەو ڕێکەوتننامەیە هەڵ بووەشێنێتەوە •

لە دوای ساڵی ١٩٦٤ راپۆرتی کاز شوناسە ئەمەریکایەکان ئەوەیان نیشان دا کە لەگەل ئەو هــــەمو گیرو گرفتە ئاڵۆزە سیاسی‌یەدا ، هێشتا وڵاتی «پاناما» لە نیکاراگوا لەبار ترە بۆ هەڵکەندنی نۆکەندێکی‌تر •• وە هەڵـکەندنی نۆکەند لە نیکاراگوادا بە گرانتر تەواو ئەبێ‌و لـــە رووی سیاسیشەوە مەترسی هەیە ••

لە ئەنجامدا لە مانگی شوباتی ساڵی ١٩٧١ دا ئەنجومەنی ســـەنای ئەمەریکا ئەویش ڕێکەوتننامەی ١٩١٤ی رەت کردەوە •

ریژیمی سوموزا تا ئەو رادەیە بەرامبەر بە ئیمپریالیزمی ئەمەریکا وەفادار بووەو داکۆکی لەســـەر کردوە • ریژیمی سوموزا لـــە هیچ کاتێکدا لە بواری نێو دەوڵەتاندا بەر پەرچی هیچ بیروڕایەکی ئەمەریکای نەداوەتەوە • سوموزا لـــە ســـاڵی ١٩٧٤ دا لـــە «مەکسیك» بڵاوی کردەوە کـــە :

**« نیکاراگوا ، وڵاتێـکی بێ لایەنی جیهانی سـێیەم نیە ، بەڵـکو وڵاتێکی وەفادارە بەرامبەر بە ڕۆژئاوا »•**

ریژیمی سوموزا هەمیشە لایەنگری دەستێوەردانەکانی ئەمەریکای کردوە لە ئەمەریکای ناوەندو دەریای کاریبی دا • جـگە لەوەش لـــە

ماوەی شەڕی کۆریادا لە ساڵی ۱۹۵۰ دا ، وە هەم لە کاتی شەڕی ڤێتنامدا لە ساڵی ۱۹٦۷ دا پێشنیاری کردوە کە هێزی سەربازی خۆی بۆ بەربەرەکانێی ئازادیخوازەکان بخاتە ژێر دەسەڵاتی ئەمەریکاوە •

سوموزا دوای پەلامار دانی ئەمەریکا بۆ سەر کۆماری « دومینیکان » لەساڵی ۱۹٦۵ دا هێزەکانی خۆی خستە ژێر دەسەڵاتی ڕێکخراوەی وڵاتە ئەمەریکاییەکانەوە •

لە کاتێکدا نیکاراگوا گەورە ترین وڵاتی ئەمەریکای ناوەندە ، لەروی مێژوییەوە بەراورد کردنی لەگەڵ وڵاتەکانی تری ئەمەریکای ناوەندا کەمتر سەرمایەی دەرەوەی راکێشاوە ••• نیکاراگوا دوا وڵاتێکی ئەمەریکای ناوەند بو کە پرۆژەی « ریفۆرمە لیبرالەکانی » پەسەند کرد • نیکاراگوا لە وڵاتەکانی تری ئەمەریکای ناوەند دانیشتوانی کەمترە ، لەگەڵ ئەوەشدا سەرمایەی دەرەوەی کەمتر تیایە تاکو وڵاتەکانی تری ئەمەریکای ناوەند ••

یەکەمین سەرمایەی گەورەی ئەمەریکا لە کومپانیای بار کردنو گواستنەوەی « کورنلیوس واندربلیت » (۱) دا کەوتە کار لە سەردەمی دۆزینەوەی زێڕدا بوو لە کالیفۆڕنیا • دوای ئەوە زیلایا سەرکۆماری لیبرال لە ساڵی ۱۸۹۳ دا هاتە سەر حوکم ، لە دەستوری کاردا بڕیاری دا سەرمایەی دەرەوە بێتە وڵاتەوە •• تا ساڵی ۱۹۱۰ بەشی زۆری بەروبومی وڵات وەکو [ قاوە زێڕ ، مۆز ، گۆشت ] •• ئەدرا بە سەرمایە ئەمەریکاییەکان • پێچەوانەی وڵاتەکانی تر دەزگا ئینحیساریەکانی بێگانە کە لە دەزگاکانی رێگای ئاسنو مۆزو ئاوو کارەبادا دەستیان هەبو ، هیچ کات دەستیان لە سەرمایەی فراوانی نیکاراگوا نەدا •

(۱) Cornelius Vanderbitt.

له ساڵی ٣٠ ـ ١٩٦٠ سەرمایەی کومپانیا ئەمەریکایەکان بە شێوەی گشتی لەسەر کەرەسەی مەعدەنی‌و بەروبومی کشتوکاڵی دا ئەنرا • لـە دوای پێك هێنانی بازاڕی هاوبەشی ئەمەریکای ناوەند لـــە ساڵی ١٩٦٠ دا سەرمایەی کومپانیا ئەمەریکایەکان لە بواری سنعەتدا خەرج ئەکرا وەکو [ پاڵاوتنی نەوت ، دەزگا کیمایەکـــان ، کارخـــانە کـــانی رستن‌و چنین و ••• ] •

ئیستا(١) سەرمایەی دەرەوە لـــە نیـکاراگوادا ئەگاتە ١٧٠ ملیۆن دۆلار ، کە ٨٠٪ی هینی وڵاتە یەکگرتوەکانی ئەمەریـکایە • سەرمایەی دەرەوە ئیستا لە بواری کەرەسەی خۆراك ، کشتوکـــاڵ ، بانقەکـــان ، کیمیاوی ، بەرهەمی دارستانەکان ، بار کردن‌و گواستنەوە خەرج ئەکرێ•

## ٢ـ ڕێژیمی سوموزا سەگی پاسەوانی ئیمپریالیزم لە ناوچەکەدا

لە ماوەی نیوە سەدەی رابوردوا رۆڵی ریژیمی سوموزا تەنیا بـــە نیکاراگواوە نەوەستا ، لە پێناوی بەجێ گەیاندنی سیاسەتی ئیمپریالیزمی ئەمەریکاو پاراستنی قازانجی بۆرجوازی‌یە گرێدراوەکانی نیـکاراگوا ، دەستی کوتایە وڵاتەکانی تری ئەمەریکای ناوەند •

لە هەمان سەرەتای شەڕی ســاردا دوا بەدوای گەشـــە کردنی راپەڕینی ئازادیخوازانەو پرولیتاریایی تاچو سوموزا دەستی کرد بـــە پاراستنی کۆنەپەرستانە ترین باڵی بۆرجوازی لە وڵاتەکانی ئەمەریکای لاتین • بەرە بەرە وەکو ســـەگی پاسەوانی ئیمپریالیزمی ئەمەریـکای لێ‌هات لە ناوچەکەدا •

(١) هەمان سەردەمی نوسینی کتێبەکەیە •

ریژیمی سوموزا بە دو شێوەی پەلامـــار دەرانەو بەرگریکارانە ئەکەوتە سەرکوتکردنی جوڵانەوە ئازادیخوازە کان • بوونی دەوڵەتێکی پێشکەوتوانـــە لـــە ئەمەریـــکای ناوەندا ئەیتوانی ئارامیو قازانجی بۆرجوازی یە گرێدراوەکان بخاتە مەترسی یەوەو هەڕەشە لـــە هـــەمو وڵاتەکانی تری ناوچەکە بـــکات • لەم روەوە سیاسەتی پەلاماردەرانەو دەست درێژکارانەی ریژیمی سوموزا وەکو کوتەکی دەستی ئیمپریالیزم بۆ خـــۆ پاراستنو بەرگری کردن لە قازانجی بۆرجوازی گرێدراوی نیکاراگوای لێ هات •

یەکەمین دەستێوەردانی ریژیمی سوموزا بۆ ناو کاروباری وڵاتانی ناوچەکە لە ماوەی چلەکاندا لە وڵاتی «کستاریکا» ساز درا ، لەو کـاتەدا ریژیمی سوشیـــال دیموکراتی «فیـگۆئەرز»(١) گیرۆدەی شـــەڕی راستڕەوەکان بوبو کە هەوڵی لەناو بردنیان ئەدا •• تاچو سوموزا چوو بە هاواری ناحەزەکانی «فیـگۆ ئەرز» و گـــەلێك یارمـــەتی داراییو چەکەمەنی پێدان •

دوای ئەوە «فیگو ئەرز» هێزە راستڕەوە کانی تێك شـــکاند ، سوموزا دەستی کرد بـــە ســـەرلەنوێ رێکخستنیانەوەو رێـگای دان کـــە لـــە خـــاکی نیکاراگواوە پەلاماری کستاریکا بدەن •

کـــاتێك پەیوەندی نێوان هـــەردو وڵات بە تەواوی تێـکچوو « رێکخراوی وڵاتە ئەمەریکایەکان » کەوتە ناو بژی کردنیانەوە ، لـــە ساڵی ١٩٥٤ دا پیلانێك کە بۆ کوشتنی سوموزا لە لایەن دەوڵەتی فیـگو

(١) Figueres.

ئەرزەوە ساز کرابو ، ئاشکرا بو .. بەرامبەر بەوە سوموزا لـــە ساڵی ١٩٥٥ دا سەر لەنوێ پەلامارێکی تازەی بۆ سەر کستاریکا ساز کرد . شەڕ گەیشتە رادەیەك «نیکسون» کەوتە ناوبژی کردنیانەوە .

ناکۆکی نێوان هەردو وڵاتەکە لەوە بـە دواوە لـــە قەوارەیەکی بچوکتردا بو ، کستاریکا دور خراوە نیکاراگوا یەکانی بەرەڵلا ئەکرد بۆ ئەوەی بچنەوە بەگژ نیکاراگوادا .

لە ســاڵی ١٩٧٥ دا [ لـــە دوای چالاکی‌یەکـــانی چەکـــدارە ساندینیستەکان ] .. سوموزا چاوی بە سەرکوماری کستاریکا کەوت ، «ئادوبر» سەرکۆمـــاری کستاریـکا بەڵێنی دا ئیتر ساندینیستەکان لـــە نیکاراگوا هان نەدات ، سوموزاش بڕیاری دا ئیتر یارمەتی راستڕەوەکانی کستاریکا نەدات .

لەوە بە دواوە هاریکاری نێوان ئەو دو وڵاتە بەهێز بو ، کستاریکا هەندیك لە چەکدارە ساندینیستەکان ـ کە لەوێ چالاکی‌یان ئەنواند ـ دایەوە بە دەست نیکاراگواوە . دو رابەری قوتابیان لە کستاریکا گیران‌و درانەوە بە کاربەدەستانی نیکاراگوا . رێـــگا درا بە دەزگـــای ئەمنیەتی نیکاراگوا تا رادەیەك چالاکی خۆیان لە کستاریکادا بنوێنن .

لـــە ســـەرەتای پەنجاکـــاندا ریژیمی پێشکەوتوو دیموکراتی «ئاربنز»(١) دەسەڵاتی دەوڵەتی لە گواتیمالا گرتبوە دەست .. ئەم کارە هـــەڕەشەی لـــە دەســـەڵاتی ئیمپریالیزمی ئەمەریـکاو بۆرجوازی‌یە گرێدراوەکانی ناوچەکە ئەکرد . لەم روەوە سوموزا لە ساڵی ١٩٥٢ دا لە چاو پێکەوتنێکدا لەگەل کاربەدەستانی باڵای دەوڵـــەتی «ترومن»دا

---

(١) Arbens .

نەخشە یەکی بۆ لەناوبردنی ریژیمی ئاربنز خستە بەرچاو ، ئەگەرچی ئەمەریکا نەخشەکەی قبول نەکرد بەڵام لە بارەی مەسەلەکەوە ، ئەرکی لێکۆڵینەوەی ئەم کارەی بە ئاژانسی ناوەندی جاسوسی «سیا ـ CIA سپارد •

ساڵی ١٩٥٤ هێزە راستڕەوەکان بە سەرکردایەتی «کاستیلو ئامارس»(١) لەژێر چاودێری راستەو خۆی رێکخراوی جاسوسی «سیا» دا پەلاماری گواتیمالای دا • فرۆکە بۆمبا هاوێژە ئەمەریکاییەکان لە خاکی نیکاراگواوە پەلاماری گواتیمالایان ئەداو لە ئەنجامدا ریژیمی ئاربنز لە ناو چو •

ساڵی ١٩٥٩ کاتێك شورشی «کوبا» سەرکەوت ریژیمی سوموزا ئامادەیی خۆی دژی کوبا راگەیاند • تەنانەت بەر لەوەش لویس سوموزا گەلێك کەرەسەی تەقەمەنیو چەکی لە دژی لەشکری پارتیزانی «کاسترۆ» نارد بو بۆ کوباو گەلێك یارمەتی دارایی دابو بە ریژیمی « باتیستا » •

دژی شۆرشەکانی کوبا ، دوای دەورەیەکی فێر کردنی مەشقی سەربازی‌یانە لە نیکاراگواو ناوچەکانی تری بەندەرەکانی نیکاراگوا لە ساڵی ١٩٦١ دا پەلاماریان بردە سەر دورگەی بەرازەکان بە پێی نەخشەی «سیا» بەڵام خەڵکی قارەمانی کوبا ئەو پەلامارە دوژمنانەیان تێکشاندو زۆریان لەدژی شۆرشەکان کوشتو ژمارەیەکیشیان لێ بەدیل گرتن •

---

(١) Castillo Armas.

ئیستا(۱) ، هەندێك كومپانیای سوموزا وەكو كومپانیاكانی «نوڤەدادس»(۲) و «پلاسما فرسیس»(۳) ـ كومپانیای خوێنەكان ـ لە لایەن راكردوە كوباییەكانەوە بەڕێوە ئەبرێن هەندێكی تریشیان لە كێلگەكانا كار ئەكەن •

سوموزا لە ڕێگای راكردوە كوباییەكانەوە هێزێكی نێو نەتەوەیی دژ بە پێشكەوتنی دامەزراندوە ، كە بۆ پەلامار بردنە سەر دوژمنەكانی خۆی هانیان ئەدات ••

لە سالی ۱۹٦٤ دا «شورای بەرگری ئەمەریكای ناوەند ـ كاندەكا »(٤) لەسەر پێشنیاری ئەمەریكا بە رەسمی دامەزرا •• ریژیمی نیكاراگوا رولێكی گەورەی لە بارەی دامەزراندنی ئەو شورایەوە گێڕا • كاری پارتیزانیو ئەم شورایە بریتیبوو لە هاریكاری كردنی دژی ئالوگۆڕی چالاكی جاسوسیانە ، چاودێری هاتوچۆ كردن لە نێوان دەولەتە ئەندامەكانیدا •

لە سالی ۱۹٦٥ دا پاسەوانی گەلی نیكاراگوا بەشداری پەلاماری چەكدارە دەریاییەیە ئەمەریكاییەكانی كرد بۆ سەر كۆماری «دۆمنیكیان» دە سال دوای ئەوەش تاچیتو سوموزا پێشنیاری بۆ ئەمەریكا كرد كە لەشكرەكەی ئامادەیە شەڕی ڤیتنامیەكان بكات •

دەستێوەردانی ریژیمی سوموزا بۆ ناو كاروباری گواتیمالا لە دوای لەناوبردنی ریژیمی ئاربنز درێژەی كێشا • لە سالی ۱۹٦٤ رایگەیاند

---

(۱) سەردەمی نوسینی كتێبەكەیە

(۲) Novedades.

(۳) Plasmafersis.

(٤) Central American Defense Council - - CONDECA -

کە بەهێز بونی راپەڕینی چەکدارانە لە گواتیمالادا هەڕەشە لە نیکاراگوا ئەکات ، وە بۆ سەرکوتکردنی ئەو راپەڕینە هەمیشە ئامادەیە ٠

دەستێوەردانەکانی سوموزا بۆ ناو کاروباری ئەمەریکای ناوەند تەنیا ئەوانە نیە باسمان لێوە کردن ، بەڵکو دەسەڵاتی ناوچەیی ریژیمی سوموزا چەندان لایەنی سیاسیو ئابوری هەمە جۆرەی هەیە ٠

بنەماڵەی سوموزا دەوڵەمەند ترین دەستەی ئابوری ئەمەریکای ناوەندن ٠ کە سەرمایەیەکی زۆریان لەو ناوچەیەدا خستۆتە کار ٠ بە زۆری سەرمایەکانیان لە وڵاتەکانی فەنزەویلا ، کۆلۆمیا ، کستاریکا ، گواتیمالادا ئەگێڕن ٠ ئەو دابو دەزگایەی ئەمڕۆ بنەماڵەی سوموزا لەگەل هەندێك لە رابەرەکانی ئەمەریکای ناوەندو راکردوە کوبایەکان دایان مەزراندووە ، تەنیا دەستەیەکی ئابوری ، سیاسی نیە ، بەڵکو سەندیکایەکی کانگستری شێوە مافیایە کە لە ئاستێکی فراوانتردا لەگەل سەرمایە ئینحیساری یەکانی ئەمەریکادا گرێی خواردوە ٠

## ٣ـ سیاسەتی ئیمپریالیزمی ئەمەریکا

لە نیزیکەی نیوە سەدەی رابوردوا رێبازی سیاسەتی دەرەوەی ئەمەریکا لە نیکاراگوا بریتی بوە لە پاراستنی ریژیمە جۆر بە جۆرەکان کە لە ژێر دەسەڵاتی دەستەی دارایی ئابوری سوموزا[سومو سیمو](١) دا حوکمی وڵاتەکەیان ئەکرد ٠٠

دەستەی دارایی ـ ئابوری سوموزا بە هۆی ئیمپریالیزمی ئەمەریکاوە دامەزراوەو لە رێگای پەیوەندی یەوە بە سەرمایەدارە ئینحیساری یەکانی

(١) Somocimo.

ئەمەریکاوە گەشەی کردوە • لەبـــەر ئەوە هەرگیز بۆی ناکرێ دژی سیاسەتی ئەمەریکا بوەستێ •• جگە لەوەش کـــە قازانجی ئەو دەستە دارایەی سوموزا لە هەمو بوارێکدا بەستراوە بـــە قازانجی کۆمـــەڵە تایبەتی یە ئابوریەکانی ئیمپریالیزمی ئەمەریکاوە •

ناکۆکی نێـــوان سوموزاو دەوڵەتی «ترومن» زیاتر لە ساڵێـــکی خایاند ، لە ئەنجامدا سوموزا بـــە پێی فەرمـــانی ئەمەریـــکا لەگـــەل ناحەزەکانیا کەوتە گفتوگۆ کردنەوە •

ریژیمەکانی سوموزا هەمیشە لـــە لایەن کۆنەپەرستانە ترین باڵی ئیمپریالیزمی ئەمەریـــکاوە پشتگیری لێ ئەکرا •• هەروەهـــا خۆیشی پشتگیری لـــە باڵـــە راستەکـــانی سەرمایەداری گرێدراوی ولاتانی ئەمەریکای لاتین ئەکرد •

تاچیتو سوموزا پشتگیری لە سەربازی یە راستڕەوەکانی ولاتانی سلفادۆر ، هیندوراس ، گواتیمالا ئەکرد •• تەنانەت لـــە کاتێکدا کـــە سیاسەتی ئەمەریـــکا داوای بـــکردبایە ریژیمی یاسایی حوکمی ولات بگرنە دەست • سوموزا هەمیشە هەوڵی ئەوەی داوە بە پێی سیاسەتی باڵێکی ئیمپریالیزمی ئەمەریکا ریژیمە مام ناوەندی یەکانی وەکو ریژیمی فیگو ئەرز لە کستاریکاو بتانکورت(۱) لەفەنزەویلا کە پەیوەندی یەکی باش‌و دۆستانەشیان لەگەل ئەمەریـــکادا هەبوەو باڵێکی تری ئیمپریالیزمی ئەمەریـــکا پشتگیری لێ ئەکردن لە ناویان ببات •

جگە لەوەش سیاسەتەکانی سوموزا لـــەناو خـــۆی نیکاراگوادا جاروبار پێچەوانەی لیبرال ئیمپریالیستەکانی ئەمەریکا ئەوەستا •

---

(۱) Betancourt.

هاتە سەرکاری کاپیتالیستی لە نیکاراگوا لە ماوەی نیوە سـەدەی رابوردود بـە زۆری لـە رێـگای فراوانبونی دەستە ئابوری‌یەکانی سوموزاو زۆر هێنان بۆ دەستە ئابوری‌یەکانی ترو شـان بەشانی بەهێز بونی بورجوازی بۆروکراتو دەزگاکـانی دەوڵەت لـە لایەکـەوەو سەرکوتکردنی راپەڕینی خەڵك لە لایەکی ترەوە هاتۆتە دی •• لیبرال ئیمپریالیستەکان نەبونی دیموکراتی بۆرجوازی لە نیکاراگواو بەرگیری کردنو رێـگا نەدانی باڵـە سەرمایەداری‌یە گرێدراوەکـانی تر کـە بەشداری دەسەڵاتی سیاسی نەکەن ئەمەیان بە هۆی نەبونی سیاسـەتێکی گونجاو دائەنا لە نیکاراگوادا ، وە زۆریان بۆ ریژیمی سوموزا ئەهێنـا کە پایەی کۆمەڵایەتی خۆی فراوانتر بـکات •

لە ساڵی ١٩٥٠ دا گفتوگۆی تاچیتو سوموزا لەگەل حزبی کۆنـە پارێزی نیکاراگوا بە ئەنجام گەیشت •• حزبی ناوبراو بەرامبـەر بـە هەندێك ئیمتیازاتی تایبەتی هەڵبژاردنەوەی سـەر لـە نوێی سوموزای بۆ سەرکۆماری نیکاراگوا قبوڵ کرد • لەو کـاتە بە دواوە یارمـەتی ئەمەریکا بۆ سوموزا زۆر تر بو • راوێژکارانی هێزی ئاسمانیو زەوی لەگەل چەندان بار چەکی هەمە جۆرە بەناوی [یارمەتی سەربازی]یـەوە بەرەو نیکاراگوا کەوتنە رێ•ئەم کارە لە سەرتا سەری شەستەکانو دوای شۆرشی کوبا بە زۆری ئەنجام ئەدرا ، وە بە پێی بەرنامەی [ یەکـێتی بۆ پێشکەوتن ] چەندان ملیۆن دۆلاری تر درا بە نیکاراگوا •

لە سەرتاسـەری دو رۆژگـاری ٥١ ـ ١٩٦١ و ٧٠ ـ ١٩٧٥ دا باڵوێزەکانی ئەمەریکا لەو وڵاتانـەدا بێ هیچ مەرجو بەڵێنێك پشـتگیری یان لـە ریژیمـی سوموزا ئەکرد •

« تۆماس ولان » له رۆژگاری یەکەمو « ترنرشلتون » له رۆژگاری دووەمدا بوبونه یەکەمین راوێژکاری سیاسی بنەماڵەی سوموزا ٠٠ ولان گەلێك پڕوپاگاندەی له بارەی پشتگیری کردن له ڕیژیمی سوموزاوه له ئەمەریکادا بڵاو کردەوە ٠ له کۆتایی پەنجاکاندا هێزەکانی دژی سوموزا له واشنتۆن ، هەروەها ئەپۆزیسیۆنی ناوخۆ به توندی داوای لابردنیان کرد ٠ ئەویش دوای هاتنە سەرکاری « کەنەدی » و گۆڕان له سیاسەتی دەرەوەی ئەمەریکادا ، له مانگی شوباتی ساڵی ١٩٦١ دا چو بۆ واشنتۆن ٠

له سەرەتای شەستەکاندا سوموزا لەگەڵ ئەپۆزیسیۆنی بۆرجوازی دا دەستی کرد به گفتوگۆ کردن ٠ تەنانەت ناچار بو واز له هەڵبژاردنی ساڵی ١٩٦٣ بهێنێ ٠ « رنەشێك » به سەرکۆمار هەڵبژێردرا ٠

بەشێوەی گشتی له ساڵەکانی ٦٨ – ١٩٧٨ دا ئەمەریکا زیاتر له بیست ملیۆن دۆلاری به شێوەی یارمەتی سەربازی دا به ڕیژیمی نیکاراگوا ، شیاوی باسکردنه دانیشتوانی گواتیمالا سێ ئەوەندەی خەڵکی نیکاراگوایه کەچی له هەمان سەردەمدا هەمو ئەو یارمەتیانەی ئەمەریکا داویتی به گواتیمالا تەنیا ٢٣ ملیۆن دۆلار بووە ٠

ئەو یارمەتیانەی ئەمەریکا ئەیدا به نیکاراگوا لەبەر ستراتیجیتی ولاتەکه نەبو ، بەڵکو لەبەر ئەوە بووە ڕیژیمی سوموزا له چەندان سەرەوەو لەگەل دەزگا ئابوری‌یەکانی ئەمەریکادا خۆی هەڵپێکابو ، که هەر جۆره گۆڕانێك لەو ولاتەدا ئەبو بە هۆی ئاڵۆزی باری بەشێك له ئابوری ئەمەریکا له ولاتدا ٠

دۆستەکانی سوموزا کە زوربەیان پەیوەندی یان لەگەڵ دەزگـا سنعەتی‌یە سەربازی‌یەکانی ئەمەریکادا هەبو ، هەمیشە هەوڵی ئەوەیان ئەدا قەرزو قوڵەی سەربازی بەلێشاو بدرێت بە نیکاراگوا • «ریچارد نیکسون» یەکێکە لە دۆستە نزیکەکانی سوموزا کە دوای ئەوەی بەسـەر کۆمـار هەڵبژێـردرا لە سـاڵی ۱۹۷۱ دا سوموزای بە رەسمی بانـگ کرد بـۆ ئەمەریـکا ••

# گێژاوی شۆرشگێڕانه

هەر لە سەرەتای ساڵی ١٩٧٨ دا وڵاتی نیکاراگوا گۆڕانێکی گەورەی کۆمەڵایەتیانەی بە خۆوە گرتو زەمینەیەکی لەبار بۆ گەشــە کردنی شۆرش ساز بو .. چینەکـانی کۆمـــەڵ بە گورجی یەکانـگیر ئەبونو جوڵانەوەی خەڵك لە شێوازێکی نوێدا خۆی ئەنواند ..

تێکشکانی پەلامار بردن بۆ سەر چەکدارە شۆرشگێڕەکان لە مانگی شوباتی ١٩٧٨دا نەك وەکو کۆتایی راپەڕینـــەکە بو ، بەڵـــکو وەکو سەرەتای راپەڕین دەرکەوت .

لێـــکۆڵینەوە لە بارەی چۆنێتی هێـــزە شۆرشگێڕەکانو راپەڕینی ئەپۆزیسیۆنی بورجوازی لە لایەکو چۆنێتی باری دەزگا دەسەلاتداری یەکانو ستراتیجی ئیمپریالیزمی ئەمەریکا لە بارەی نیکاراگواوە لە لایەکی ترەوە ، تا کاتی نووسینی ئەم کتێبە «حزیرانی ١٩٧٩ » لـــەم باســـەدا ئەخەینە بەرچـــاو .

## ١ـ يەکێتی تاکتیکی :

### راپەڕینی یەکگرتووانەی خەڵك

لەگەل هاتنە کایەی زەمینەی شۆرشگێرانەدا لە نیکاراگوا ، هـەلو مەرجی لەبار بۆ یەکگرتنی هێزە شۆرشگێرەکان زیاد لە هەر کاتێکی تر هاتە دی .. ئەو هۆیانەی هێزە شۆرشگێرەکانیان لێك دابڕ ئەکرد بەرەو نەمان ئەچون ٠ راپەڕینەکە خۆی بەسەر هەمو خەڵـکدا ئەسەپاند ٠ باڵی پرۆلیتاریایی ساندینیستا ئیتر نەی ئەتوانی لە کاتێکدا کۆمـــەڵ بەگشتی ئامادەی راپەڕین بێت خۆی بەسەر کرێکاران‌و کاری سیاسی‌و رێکخستنی دا بسەپێنێ ..

باڵی پرولیتاریایی میلیشیایەکی ســـەربازی بـــە ناوی « کۆماندۆ شۆرشگێرەکانی خەڵـــکەوە پێك هێنـــاو خـــۆی بۆ بەشداری کردنی راپەڕینەکە ئامادە کرد ٠ هەوڵی‌دا جوتیاران‌و کرێکارە کشتوکاڵی‌یەکان رێك بخات .. لە مانگی مارسی ١٩٧٨ دا رێکخراوێـکی گشتی بـە ناوی «یەکێتی کرێـکارانی لادێ»(١) دامـــەزرا ، کـــە ئەرکی رێکخستنی جوتیارەکانی بۆ راپەڕین گرتبوە ئەستۆ ٠

لەو کاتەدا دەستەو کۆمەلە لایەنگرەکانی « شەڕی درێژ خـایەنی خەڵك » دەستیان کرد بە چالاکی نواندن لـــە بارەی بەهێـــز کـــردنی رێکخراوە شاریە کانەوە ، بە تەواوی لـە ناوچەکـانی ژوروی وڵاتدا ٠ راپەڕینەکانی خەڵك ئەو باڵەیان قایل کرد کە کۆمـــەڵانی خـــەڵك بۆ راپەڕین خـــۆیان ئامادە کردوەو پێویستە بەرەی ئازادیخوازی گـــەلی ساندینیستا رابەری شۆرشگێرانەیان بـــکات ٠

(١) The Rural Workers Association.

بەر لەوە ئەو دو باڵەی لە سەرەوە باسکران لەو باوەڕەدا بوڹ کــە ڕاپەڕین بە بێ بوونی ڕێکخراوی خەڵـکی تەنیا خزمــەتی بۆرجوازیو ئیمپریالیزم ئەکات .. چونکە ئەوانە هەوڵی ئەوەیان ئەدا بنــە جێـگری سوموزا زیاد لە هێزە شۆرشگێرەکان ئەتوانن سود لە ڕاپەڕینی خەلکەکە وەر بـــگرن .

بەڵام بۆرجوازی بە تەواوی پارچە پارچە بوبو توانای ئەوەی نــەبو ڕابەرایەتی ڕاپەڕینی کۆمەڵانی خەڵـکی بکات . چەکدارە ساندینیستەکان بە زۆری ناوبانگیان لەناو خەڵکدا پەیدا کردبو .

ترسریستاس لەو باوەڕەدا بو کە بۆرجوازی بە تەواوی لــە یەکتر دابڕاوونو بەشداری کردنی ساندینیستا لە بەرەیەکی هەمــە لایەنیانەدا دژی سوموزا لە هــەلو مەرجێکی بەو جۆرەدا بـــە قازانجی هێـــزە شۆرشگێرەکان تەواو ئەبێتو ڕابەری بەرەکەش هــەر ئە کەوێتە دەست ئـــەوان .

تاکتیکەکانی ترسریستاس بێ ڕەخنە نەبون ، ئەوانە نەیان ئەتوانی بە وردی چۆنێتی لەشکری سوموزا لێك بدەنەوە .. گەورە ترین هــەڵەیان ئەوەبو بە هەڵە پەیوەندی نێوان ئیمپریالیزمو بۆرجوازیە گرێدراوەکانی نیکاراگوایان لێك ئەدایەوە . ترسریستاس بایەخی کــەمی بـــە توانای پەیوەندی نێـوان پاسەوانە گەلیەکانو ڕیژیمی ســوموزاو ئیمپریالیزمی ئەمەریــکاو باڵی بەناو «لیبرال» ئـــەدا ، وای ئەزانی بـــە ڕاپەڕینـــی چەکدارانەی خەڵك ئەتوانێ ئیمپریالیزم بێ لایەن بـــکاتو پاســـەوانە گەلیەکان لەناو ببات .

لەگەل ئەوەشدا ، لەگەل ئەو ناکۆکیانەدا ، سێ باڵەکەی ناو بەرەی ساندینیستا توانی‌یان لــە مانــگی تەموزی ١٩٧٨ دا ڕێــکەوتننامەیەکی یەکێتی تاکتیکی مۆر بکەن‌و کۆمیسیونێکی یەکسانی گشتی دامەزرێنن • ئەو سێ باڵە ، ناکۆکی‌یە گرنــگە ئایدیۆلۆجی‌یەکانیان بە رەسمی ناسی‌و ڕایانگەیاند کە یەکێتی‌یەکەیان دوا دارو بەهێزە •

هەر دوا بە دوای مۆر کردنی ڕێکەوتننامەکەدا ڕێکخراوێکی تازە بە ناوی «ڕاپەڕینی خەڵــکە یەکگرتوەکان»(١) دامەزرا جگە لــە سێ باڵەکەی ناو بەرەی ئازادیخوازی گەلی ساندینیستا ، حــزبی سوشیالیستی نیکاراگواو زیاتر لە بیست ڕێکخراوی قوتابیان‌و کرێکاران‌و خەڵــکی تر چونە ناو ئەو ڕێکخراوەوە « ڕاپەڕینی خەڵــکە یەکگرتوەکان » چــەندان کومیتەی لە دژی سوموزا دامەزران‌و بەرنامەیەکی گشتی داناو دەوڵەتی کاتی بۆ جێ‌نشینی سوموزا هەڵبژارد •

## ٢ـ شەڕی ناو خۆیی

یەکێتی تاکتیکی هەرسێ باڵەکەی ناو بەرەی ئازادیخوازی گــەلی ســاندینیستاو دوا بەدوای ئــەو دامــەزراندنی « ڕاپەڕینی خەڵــکە یەکگرتووەکان » لە کاتێکدا کە کۆمەڵ دوچاری گێژاو بوبو ، بو بــە هۆی گەشە کردنی عونسورەکانی شۆرش •• لەوە بەدواوە مەســەلەی ڕاپەڕینی چەکدارانەو گۆڕینی بۆ شەڕی ناو خۆیی کارێکی حەتمی بو •

لەو کاتەدا بۆرجوازی‌یەکانی نیکاراگوا خــۆیان یەك ئەخست ، بۆرجوازی‌یە گەورەکان کە لەگەل سوموزادا ناکۆك بون بریتی بون لــە دوو دەستەی دارایی « بانقی نیکاراگوا » و « بانقی ئەمەریکا » کــە لە

(١) United Peoples Movement - UPM.

مانگی مارسی ۱۹۷۸ بە دواوە لە کاتی راپەرینی دیموکراتیانەی نیکاراگوادا دامەزرا بون ، ئەوانیش بۆ راگرتنی سیستەمی سەرمایەداری گرێدراو هاتبونە مەیدانەکەوە .. ناکۆکی ئەوان لەگەل سوموزادا ئەوەبو بنەماڵەی سوموزا دەسکاری هەندێك لە بەشە ئابوری‌یەکانی ئەوانی ئەکرد .

بۆرجوازی ناوەندو بۆرجوازی بچوکو ئەو بەشە بۆرجوازی‌یە گەورەیە کە لەگەل سێ دەستە دارایە ئابوری‌یەکەی نیکاراگوادا پەیوەندی بەهێزیان نەبو لە ناو «یودل»دا خۆیان رێکخست .. یودل لە مانگی مایسی ۱۹۷۸ دا توانی لەگەل دەستەی دوازدە کەسی بەرەیەکی فراوانی ئەپۆزیسیون پێك بێنن .

ئامانجی یودل ئەوەبو جۆرە دیموکراتیەتێکی بۆرجوازیانە لە لە نیکاراگوادا بێنێتە کایەوەو ناخی ئابوری‌و سیاسی لیبرالیزە بکاتو سنور بۆ گرێدراوی سیاسی‌و ئابوری لەگەل ئیمپریالیزمی ئەمەریکادا دابنێت .

دەستەی دوازەدە کەسی رادیکالترین بەشی بۆرجوازی نیکاراگوان ، سیاسەتی بنچینەیی ئەم دەستەیە لا خستنی باڵی چەپی « بەرەی ئازادیخوازی گەلی ساندینیستا »و یەکگرتنی لەگەل باڵی ترسریستاس‌و باڵی چەپی یودل‌و لەناوبردنی ریژیمی سوموزا بو .

روداوەکانی نیکاراگوا ئەوەیان نیشان ئەدا کە هیچ یەکێك لە باڵە بۆرجوازی‌یەکان توانای ئەوەیان نیە رێگایەکی چارەسەریانەی لەبار بۆ چارەسەر کردنی گێژاوی نیکاراگوا بدۆزنەوە کە ئەمەریکاش پێی

قایل بێت • ئەمــــە وای کردبو ئەمەریـــکا هیوای بە دەستەی دوازدە کــەسی بێت •

لەم روەوە لە مانگی تەموزی ساڵی ١٩٧٨ دا سوموزا ناچـــار بو رێـگای دەستەی دوازدە کەسی بدات بگەڕێنەوە بۆ نیکاراگوا ، لە رۆژی هاتنەوەیانا بۆ نیکاراگوا ، لەگەل ئەوەشدا دەولەت پێی ناخۆش بــو ، بە دەیان هەزار کەس چو بون بۆ فرۆکە خانە بە پیری یانەوە •• لـــە کاتی پێشوازی کردنیاندا چەندان دروشمی لایەنگرانەیان هەلگرتبوو •

لە ٢٢ی ئابی ١٩٧٨ دا باڵی ترسریستاس چالاکی‌یەکی بێ وێنەیان نواند ، ٢٤ کەس لە شـۆرشگـێرە ساندینیستەکان بە ســەرکردەیی « ئەدن پاستورا » (١) پەلاماریان بردە سەر کۆشـکی گەلی لە نیکاراگوا، زیاتر لە هەزار کەسی ناسراوو دەرکەوتووی دەولەتەکەی سوموزا کە ٦٥ کەسیان نوێنەری ئەنجومەن‌و خزم‌و کەس‌و کـاری سوموزا بـون بەدیل گرتنیان •• داگیر کردنی کۆشکی گەلی ماوەی ٦٥ ســـەعاتی خایاند ، سوموزاهیچی بـۆ نەکرا ناچار بو بە دەنگ دا خوازیەکانیانەوە بچێت ، دیکتاتوری نیکاراگوا ناچار بو ٨٥ کـەس لـە زینـــدانی‌یە شـۆرشگێرەکان بەرەڵلا بکات ٥٠٠ هەزار دۆلار پـارەیان بـداتــێ‌و بەیاننامەکەشیان لە رادێووە بلاو بکاتەوە کە هەمـوی ســەرزەنشـــتی سومووزای ئەکرد • لە بەیاننامەکەدا داوایان لە خەڵك کردبو خـۆیان بۆ راپەڕین گورج بکەنەوە •• ئەوەشیان وتبو کە ئامادەن لەگەڵ دەستەو کۆمەڵە سیاسیەکانی تردا دەولەتێـکی جێ نشینی سومووزا دەســــت نیشان بکەن •

---

(١) Eden Pastora.

کاتێك شۆرشگێڕە ساندینیستەکان لەگەل زیندانی‌یە بەرەڵلا کراوە سیاسی‌یەکاندا گەیشتنە فڕۆکە خانە ، بە دەیان هەزار لە خەڵکی « ماناگوا » ئالای ساندینیستایان بە دەستەوە گرتبو ، سرودەکانیان ئەخوێندن‌و قارەمانەکانی خۆیان بەرێ ئەکردن .

چالاکی ۲۲ ی ئاب بو بە هۆی زیاتر ساز کردنی زەمینەی شۆرش‌و تەپاندنی ورەی دەسەڵاتدارانی دەوروبەری سوموزا ، لەو کاتەدا کۆشکی گەلی بە دەست شۆرشگێڕەکانەوە بو ، لەشکرێکی بێ شوماری سوموزا ئەیویست کۆشکەکە وێران بکات .. ئەم رووداوە جیهانی لە بارەی ناو خۆی نیکاراگواوە تێ گەیاند .

دوا بەدوای ئەو چالاکی‌یە مانگرتنی گشتی لە «ماناگوا» دەستی پێکرد . بە پێچەوانەی رابوردوەوە ئەمجارە چینی کرێکار هێزی سەرەکی مانگرتنەکەی بون .

لە شارەکانی تریشدا مانگرتن‌و خۆ نیشاندان بە گورجی دەستی پێکرد ، هەمو دەستە چەکدارەکانی ساندینیستا بۆ ۹ی تشرینی‌یەکەم خۆیان گورج کردەوە .

لە ۲۷ی ئابدا نزیکەی ۵۰۰ کەس لە کرێکاران‌و جوتیاران‌و قوتابیان شاری «ماتاگالپا» کە سێیەمین شاری گەورەی نیکاراگوا بو لە ناکاو خستیانە ژێر دەستی خۆیانەوە .. هێزەکانی بەرەی ئازادیخوازی گەلی ساندینیستا دوای ئەم کارە یارمەتی شۆرشگێڕەکانی دا ، لە سەرەتاوە شۆرشگێڕەکان تفەنگی راوی‌و حەوت تیرو نارنجۆکی دەستی‌و تەورو چەقۆیان پێ بو .. بەڵام کاتێك کۆشکی گەورەی

پۆلیسی‌و مەڵبەندەکانی پاسەوانی گەلی داگیر کران گەلێك تفەنگ‌و شەستیریان کەوتە دەست •

لە کاتێکدا لاوە شۆرشگێڕەکان خەریکی چالاکی شۆرشگێڕانە نواندن بون ، خەڵکی شار خواردەمەنی‌و پێویستی تریان بۆ ئامادە ئەکردن هێزەکانی پاسەوانە گەلی‌یەکان بە گورجی خۆیان گەیاندە شاری «ماتاگالپا» •• شۆرشگێڕەکان لە بەر ئەوەی چەك‌و تەقەمەنی تەواویان نەبو نەیانویست شەڕی روبەرویی بکەن •• خۆیان کێشایەوە بۆ چیاکانی دەورو بەری شار • پاسەوانەکان بەهۆی تانگ‌و تۆپ‌و شەستیرو هەلیکۆپتەرەوە شارەکەیان داگیر کردەوە ، بە شێوەیەکی دڕندانە پەلاماری هەمو ماڵەکانیان ئەداو گەلێك لاویان بە تاوانی ئەوە کوشت گوایا یارمەتی شۆرشگێڕەکانیان داوە •

سەر لە بەیانی رۆژی نۆیەمی تشرینی‌یەکەمی ١٩٧٨ دا لە کاتێکدا کە شۆرش خۆ بەخۆ سەرتاسەری نیکاراگوای گرتبۆوە ، لە کاتێکدا کە لە زۆر شوێن‌و جێگادا خەڵك بە دارو بەردو تەورەوە راپەڕیبون ، هێزەکانی ساندینیستا پەلاماریان بردە سەر بنکەکانی پاسەوانە گەلی‌یەکان لە شارەکانی ماناگوا ، ماسایا ، لیون ، چیناندگاو ئاستلی •• لە هەمو شارو لادێکاندا خەڵك پەلاماری بنکەکانی پاسەوانەکان‌و پۆلیسیان ئەداو دەستیان بەسەر دەزگاکانی دەوڵەتدا ئەگرت •• شۆرشگێڕەکان خەڵکیان لەو شوێنانە کۆ ئەکردەوە کە رزگاریان ئەکردو چەکیان بەسەرا دابەش ئەکردن •• گرتنی چەند پۆلیسخانەو بنکەی سوپایی بوونە هۆی ئەوە چەك‌و کەرەسەیەکی زۆری تەقەمەنی بکەوێتە دەست شۆرشگێڕەکان •

له ماناگوا ، پایتەختی نیکاراگوا ، بەلای کەمەوە شەش مەلبەندی پاسەوان‌و پۆلیس لە سەرەتای راپەرینەکەدا خۆیان دا بە دەست شۆرشگێرەکانەوە ، ژمارەیەکی زۆر شەستیرو چەکی ئیسرائیلی‌و نارنجۆك بە تالانی گیران •

بە پێی نەخشەیەکی ساز دراو بڕیار وابو لە کاتێکدا دەستە چەکدارەکانی پاسەوانە گەلی‌یەکان لە شارەکانی ژورودا خەریك شەڕ بن هێزێکی ئامادەی بەرەی ساندینیستا لە کستاریکا پەلاماری شارەکانی خوارو گرانادا ، رێواس ، پناس ، بلانکاس بدات‌و لەو ناوچە رزگار کراوە دەولەتی کاتی شۆرش رابگەیەنێت •

بەلام ئەو بەرنامەیە وەکو دانرابو نەیتوانی ئەرکەکانی خۆی جێ بەجێ بکات •• هێزەکانی سوموزا کە لە شارەکانی سەر سنوری پناس بلانکاس دا بون بە پشتیوانی هێزی ئاسمانی یەوە توانی‌یان پەلاماری شۆرشگێرەکان رەت بکەنەوەو رێگای پەلامارەکەیان لێ بگرن •• پاسەوانە گەلی‌یەکان توانی‌یان لە «ماناگوا» شۆرش لەناو بەرن ، بەدەر کردنی شۆرشگێرەکان لە شارەکاندا ، بەشی زۆری هێزەکانی دەولەت لە ژێر سەرکردەیی کوڕێکی ٢٧ سالەی سوموزادا ناوچەکانی شۆرشیان گەمارۆ دا •

شارە گەمارۆ دراوەکان لە سەرەتاوە بە هۆی تانك‌و فڕۆکەوە بۆمباران کران • لەو بومبارانەدا گومانیان لە هەر شوێنێك بکردبایە وێرانیان ئەکرد • دوای ئەوە پاسەوانەکان لەگەل لەشکرێکی راکردوە کوبایەکانداو ئەمەریکایە بەکرێگیراوەکان پەلاماری شارەکانیان دا ••
هەمو ئەو کەسانەی یارمەتی شۆرشگێرەکانیان دابو گیران‌و ئیعدام کران •

ئـــەو تاوانانەی پاسەوانەکـــانو بەکرێــگیراوە ئەمەریکاییەکانو راکردوە کوبایەکان کردیان تا ئـەو کـــاتە وێنەی نەبوە •• دەستدرێژی بۆ ســەر ریزی ئافرەتان ، تالاّنکردنی مالاّنو فرۆشـگاکان ، کوشتاری دەستە جـــەمعی ، روخـانـدنی نەخۆشخانە کـــان ، سوتاندنی ئامبولاّسەکان ، ئەمـانە بەشێك بون لـــە کرداری دڕندانەی لەشکری سوموزا ، بەشێکی زۆری شارەکانی لیـــون ، ماسایا ، ئاستلیو چیناندگا وێران بونو زوربەی خەڵـکە کانیان رایانـکرد بۆ ناوچـــە شاخاوی‌یەکانو ولاّتەکانی دراوسێیانو هەندێکیشیان چونە ناو لەشکری ساندینیستاوە •

بەمجۆرە پاسەوانی گەلی سوموزا توانی بەهۆی کوشتنی هـــەزاران کەسی بێ دیفاعەوە ئەو ناوچـانەی شۆرشگێرەکان گرتبویانە ژێر دەستی خۆیان داگیریان بکەنەوە •• دوای ئەوە کەوتنە وێزەی خەڵكو دەوڵـەتی سەربازی‌یان دامەزراند •

راپەڕینی تشرینی‌یەکەم ، لە کاتێکدا لە روی سەربازی‌یەوە تێکشکا ، بەلاّم سەرکەوتنێکی سیاسیانەی بۆ بەرەی ساندینیستا هێنایە کایەوە •

هەرسێ باڵەکەی ناو خۆی بەرە رایان گەیاند کە توانیویانە چەندان ئاقیکردنەوەی جەنـگیو رێکخستن لـەم راپەڕینەدا بـە دەست بێنن •• هەروەها لە پرۆژەی راپەڕیندا بە هەزاران کـەس خۆیان ئامـــادە کرد بچنە ناو ریزی شۆرشگێرەکانەوە •

ئـــەو پارەو چـــەكو تەقەمەنیانەی کـــەوتە دەست چەکـــدارە

شۆرشگێڕەکان توانای دارایی‌و سەربازی شورشگێڕەکانی زۆر تر کرد ٠

دەسکەوتە سیاسی‌یەکانی راپەڕینەکە هەندێکیان لە هەندێکیان گرنگتر بون ، لەو راپەڕین‌و شەڕە ناوخۆیەدا هێزە سەربازی‌یەکانی بەرە ئەوەندە لێ نەدران کە لە خەڵکە بێ دیفاعەکان درا ٠٠ «بەرە» کاتێك زانی دەمودەس سەرناکەوێت فەرمانی کشانەوەی لە شارەکان دەر کرد ٠ بەمجۆرە یەکەمین قۆناغی شەڕی ناوخۆیی کۆتایی پێ هات بەڵام ئابوری نیکاراگوای بەتەواوی تێکشکاند ٠٠ زوربەی کشتوکاڵکارەکان بە هۆی بۆمبارانەوە بەرو بومەکـ انیان بۆ کۆ نەکرایەوە ، کارگـەو دەزگـا سنعەی‌یەکان تا ڕادەیەك پەکیان کەوتبو ٠ گێژاوی ئابوری رۆژ بە رۆژ زیاتر پەرەی ئەسەند ٠

## ٣ـ مافی خەڵکی ئەمەریکایی ٠٠

شتێکی ئاشکرایە ئیمپریالیزمی ئەمەریکا هیچ بایەخێکی بە راپەڕینی خەڵکی نیکاراگوا نەداوە ٠٠ قازانجی ئیمپریالیزمی تاوانباری ئەمەریکا لەوەدایە ئەوەندەی بۆی ئەکرێ یارمەتی ریژیمە دژی خەڵکەکان بدات ، لەبەر ئەوە ستراتیجی سیاسەتی ئەمەریکا بریتی‌یە لە بەرگریکردن لـە سەر هێزە راستڕەوەکان ، نەهێشتنی عونسورە دڵسۆزەکـانی گـەل ، لەناوبردنی رێبازە شورشگێڕی‌یەکان ٠٠ ئەمەریکا ئەیویست هـەرچی ئیمتیازاتێك لەم روەوە بدرێ بە خەڵکی نیکاراگوا شتێـکی کـاتی بێت‌و درەنگ یان زوو لێی بسەندرێتەوە ٠

بەڵام گێژاوی شۆرشگێڕانەی خەڵکی نیکاراگوا هەمو یارمەتیدان‌و پشتگیری‌یەکی سوموزای زیندە بەچاڵ کردوە ٠٠

له ڕاستی‌دا باری ناوخۆی نیکاراگوا ئەوەی نیشان ئەدا کە هەر هەوڵو تەقەللا دانێك بۆ هێشتنەوەی دەسەڵاتو ڕژێمەکەی سوموزا بدرێت تەنیا خۆ ماندو کردنە .

وەزارەتی دەرەوەی ئەمەریکا لافی ئەوەی لێ ئەدا گوایە بەهیچ جۆر یارمەتی ڕژێمی سوموزا نادات‌و دەس بەرداری یارمەتی سەربازی بوە بۆ نیکاراگوا .. لێکۆڵینەوەی ڕاستیش ئەوەی دەرئەخست کە ئەم لاف لێدانە درۆیەو ئەمەریکا زۆر هەوڵ ئەدات کە سوموزا ناچار بکات بۆ ئەوەی باڵە چەپەکان ماندو بکات‌و هەندێك ئیمتیازات بە ئەپۆزیسیۆنی بۆرجوازی بدات . لەم ڕووەوە هەرچی کارو کردارێك کە ئەمەریکا کردویتی وەکو بڕینی یارمەتی سەربازی‌و ، بانگکردنەوەی میسیۆنە سەربازی‌یەکانی ئەمەریکا لە نیکاراگواو ، کەمکردنەوەی ژمارەی ئەندامانی باڵوێزخانەکەی .. ئەمانە هەمو کرداری شێوە سمبۆلیکیانە بون‌و هیچ جێگای باوەڕ نەبون . لە کاتێکدا ئەمەریکا یارمەتی سەربازی نیکاراگوای ڕاوەستان ٣٠ سی‌ی ملیۆن دۆلاری بە ناوی یارمەتی مرۆڤایەتیانەوە دا بە نیکاراگوا ، هەروەها یارمەتی‌یە سەربازی‌یەکانیشی لە ڕێگای ئیسرائیل‌و دەوڵەتە ڕاستڕەوەکانی سەر بە ئەمەریکای ناوەندەوە گەیاندوە بە ڕژێمی دیکتاتۆری سوموزا . هەر لە پێناوی ئەم ستراتیجەدا ئیمپریالیزمی ئەمەریکا پاڵەپەستۆیەکی توندی دیپلۆماسیانەی خستۆتە سەر دەوڵەتە میانە ڕەوەکانی ناوچەکە بۆ ئەوەی هیچ یارمەتیەکی بەرەی ساندینیستا نەدەن .

ئیمپریالیزمی ئەمەریکا لە نیکاراگوادا ڕێگای چارەسەر کردنی گیرو گرفتەکانی خەڵك‌و دەسەڵاتی نیە .. هەروەها سەرکەوتنی بەرەی ساندینیستاو تێکشکاندنی لەشکری پاسەوانە گەلی‌یەکان ئەمەریکا بە

ئەواوی ترۆ تر ئەکات ئەمکارە لـــە ئەنجامدا ئەبێتە هۆی تەقینەوەی شۆرشێکی سەرتاسەری لە ناوچەکەدا ، قازانجی ستراتیجی ئەمەریکا لـە سنورەکانی خواردوا ئەکەوێتە بەر مەترسی‌یەوە •• تەنانەت ئێستاش باری شۆرشگێڕانەی خەڵکی نیکاراگوا کارێکی زۆری کردۆتـە ســـەر ناوچەکانی دەورو بەری ، دیکتاتۆرەکانی گواتیمالاو سلفادۆر کە چەندان ساڵ لە رێگای سوموزاوە یارمەتیان پێ ئەگەیشت ، ئێستا دوچـاری گەلێك توندی‌و نارەحەتی بون •• راپەڕینی شۆرشگێڕانەی خەڵك لـــەم ناوچانە بە تەواوی گەشەی کردوەو هەلو مەرجی لەباری خولقاندووە •

لە لایەکی ترەوە لە کاتێکدا مانەوەی حوکمی سوموزا کەوتبوە مەودای محاڵەوە ، هەر جۆرە جولاَندنەوەیەك بۆ لە کار خستنی سوموزا ئەیتوانی بە ئاسانی پاسەوانە گەلی‌یەکان کەم هێز بکات •• بێ هێز بوونی ئەوانیش بـە مـــانا سەرکەوتنی راپەڕینی شۆرشگێڕانەو هاتنە سەرکاری دەوڵەتێکی خەڵکی‌یە ، کە پشت بە لەشکری شۆرشگێڕی ساندینیستا بەستێت •

رێـگای چارەسەریانەی نیکاراگوا بـە قازانجی ئیمپریالیزم ئەوە بو کودتایەکی سەربازی سەر بە ئەمەریکا دژی ریژیمی سوموزا روبداتو پیاوە نهێنی‌یەکانی ئەمەریکا بۆیاخی نیشتمان پەروەریانە لە خۆیان بدەنو بە ناوی خەڵـکەوە حوکمی ولاَتەکە بکەنو قازانجی ئەمەریـکاش وەکو جاران بپارێزن •

لە راستیدا ئەمجۆرە چارەسەریانە ، لە کاتێکدا کە رێگای تر نەبێت ، ئەتوانرێ روبدات •• ئەمەریکا بە زۆری ئەوەی رائەگەیاند کە « کوبا »

دەسکاری کاروباری ناو خـــۆی نیکاراگوا ئەکـاتو یارمـــەتی بەرەی ساندینیستا ئەدات •• بە تایبەتی لە چەند مانگی رابوردوا «کوبا» یارمەتی یەکی زۆری بە خەڵـکی شۆرشگێڕی نیکاراگوا داوە •• تەنانەت «جیمی کارتەر »ی سەرکۆماری ئەمەریـکا خـــۆی پێ را نەگیرابو ئەمەی لـــە چاوپێکەوتنێکی رۆژنامەگەریانەدا درکاندبو •

ئەمەریکا ئەیویست زەمینەیەکی چارەســـەر کـاریانە بۆ پاراستنی قازانجی خۆی بسازێنێ •• بۆ ئـەم مەبەستەش هێزێـکی ١١٠ ســەدو دە هەزار کەسی ئامادە کردبو دەست بە سەر ئەو ناوچانەدا بگرن کە قازانجی ئەمەریکایان تیا کەوتۆتە مەترسی‌یەوە ••

لە دوای دەستکردن بە پەلاماردانی تازە لە لایەن بەرەی ساندینیستاوە لـــە هەفتـــەی یەکەمی حوزیراندا ئەم نەخشەیە لـە لایەن کۆنفرانسی وەزیرانی دەرەوەی رێکخراوی وڵاتە ئەمەریکایەکانەوە کەوتە بەر باسو لێکۆڵینەوە • ئەوە پێشنیار کرا کـــاتی ئەوە هـــاتوە هەمو هێزی وڵاتە ئەمەریکایەکان بۆ چارەســـەر کردنی ریشەیانەی مەســـەلەی نیکاراگوا بخرێتـــە کـار • داوایان لە وڵاتەکانی ئەمەریـکای لاتین کرد بۆ ئەوەی بەرگیری لە خوێن رشتنو برا کوژی لە نیکاراگوادا بکرێ هێزێك بـــە ناوی «پاسەوانی ئاشتی» یەوە بنێرن بۆ نیکاراگوا ، دوای ئـەوە ســوموزا لەسەر کار لا بچێو لە ژێر چاودێری وڵاتە ئەمەریکایەکانا هەڵبژاردنێك بکرێو دەوڵەتێکی تازە هەڵبژێرن •

بەڵام باری ناوخـــۆی نیکاراگوا گەلێك لـەوە ئاڵۆز تر بو کـــە وڵاتەکانی ئەمەریکای لاتین بتوانن بەو جۆرە کارانە پینەی بکەن ، وە یان زات بکەن دەسەبەری ئەو چارەسەر کردنە بکەن • ئەو نەخشەیە قبوڵ

نەکرا • بە تایبەتی لـــە کـاتی کونفرانسەکـەدا بەشێکی زۆری وڵاتی نیکاراگوا بە دەست بەرەی ساندینیستاوە بو • لە جیاتی ئەمـە کونفرانس داوای لە سوموزا کرد کە بە گورجی دەست لە کاروباری سەرکۆمـاری بکێشێتەوە •• بەڵام سوموزا بەوە قایل نەبو •

کۆنفرانس نەی ئەویست ئەمەریکا دەسکاری چەکدارانەی ناو خۆی نیکاراگوا بـکات ، بەڵام ئەیویست سوموزا لە سـەر کـــار لابرێ • • راویژکارە سیاسیەکانیش لەو باوەڕەدا بون یارمەتیدانی کوبا نابێتە هـۆی زیاتر توندو تیژ کردنی گێژاوی ناو خۆی نیکاراگوا بەڵـکو بونی ریژیمی سوموزا رۆژ لە رۆژ زۆر تر ئاگری شەڕی ناو خۆیی نیکاراگوا خـۆش ئەکاتو زەمینەش بۆ ئەوە خۆش ئەکات کە کوبا بەر دەوام یارمـــەتی نیکاراگوا بدات •• کۆنفرانس لەو باوەڕەدا بو پێك هێنانی دەوڵەتێـکی هـــەمە لایەنیانە لە نیکاراگوادا لـــە هـــەمو شت باشترەو زەمینەش بۆ هەڵبژاردن لە بار ئەبێت •• چونکە ئەگەر ئەمە نەکرێ ئەوا ناوچـــەکە ئەبێتە گۆڕەپانی شەڕێکی بەر بڵاوی وێرانکەر •

لە دوای دامەزراندنی دەوڵەتێـکی کاتی لە لایـەن بـــەرەی ساندینیستاو هێزەکانی ترەوە ، لە کۆتایی حوزیران داو ناسینی لە لایەن دەوڵەتەکانی ناوچەکەوە ، ئەمەریکا بێ ئەوەی هیچ ئیحتیمـالێك دابنێت بە شـێوەی رەسمی داوای دەســت کـێشانەوەی سۆموزای کرد •

## ٤ـ یان مردن یان گەلی ئازاد

تێکشکانی سەربازی راپەڕینی تشرینی‌یەکەمو هاتنە دواوەی هێـزە شۆڕشگێڕەکانو کشـانەوەیان لـە شـارەکان مانای کـۆتایی هـاتن بـە

راپەڕینەکە نەبوو • ئەم خۆ کشانەوەیە تاکتیك بو ، بۆ ســـەر لەنوێ ڕیکخستنەوەو ســازدانو خۆ ئامادە کردن بۆ پەلاماری دوایی •• خۆ گورج کردنەوە بۆ پەلاماردان سەر لەنوێ پێك هاتەوە •

بە تێکشکانی سەربازی راپەڕینی تشرینی‌یەکەم دیسان کۆتایی بە شەڕی ناوخۆیی نەهات••چونکە ناوچەیەکی زۆری ناوچە شاخاوی‌یەکان لادێــکان بە دەست چەکدارە ساندینیستە کانەوە مابونەوەــو جاروبــار لێــکدانو تەقە لە نێوان هێزە شۆرشگێڕەکانو هێــزە دەوڵەتی‌یــەکانی سوموزادا روی ئەدا • خەڵــکی نیکاراگوا جگە لە شەڕو راپەڕین هیچ چارەیەکیان بۆ نەمابۆوە ، دروشمی « یان مردن یان گەلی ئازاد » کــە دروشمی ساندینیستەکان بو ، ئەمە بــوو بە دروشمی تــەواوی خەڵــکی نیکاراگوا •••

سوموزا لایەنی خەڵــکی بە تەواوی دۆڕاندبو ، تەنیـا پاسەوانەکانو ئەمەریکای بە دەستەوە مابو ، ئەیویست لە رێــگای کوشتارو تۆقاندنــەوە درێژە بە مانــەوەی حوکمی خۆی بدات •

سوموزا لە ماوەی شەش مانگدا ژمارەی پاسەوانەکانی لــە ٧٥٠٠ کەسەوە کرد بە (١٢) هەزار چەکدار •• هەروەها هێزێــکی نیمچــە سەربازیشی پێك هێنا •• لە جیاتی ئەو یارمەتیەی ئەمەریکا بڕیبوی لــە ئەرجەنتینو ئیسرائیلەوە یارمەتی بۆ ئەهـــات •• کۆمیسیۆنی مـــافی ئادەمیزاد سەر ژمارێــکی کردبو کە پاسەوانە گەلی‌یەکان رۆژی ٥ـ١٠ کەس یان بە بێ لێپرسینەوەو لێکۆڵینەوە ئەکوشت • لادێکان گوزەرانیان بە دەست گولە تۆپ بارانو فڕۆکەوە تاڵ بوبو •

زیانی گیانیو مالی رۆژ بە رۆژ زیاتر ئەبو ، شۆرشگێڕەکان پەیتا پەیتا پەلاماریان ئەبردە سەر پاسەوانەکانو ورەی پاسەوانەکان روخا بون ٠

گێژاوی ئابوری بـــە جۆرێك درێژەی کێشاو ئاڵۆز بو بو کـــە تەنانەت رێـــگای چارەسەر کردنی ریفورمیستیانەش نەمابۆوە ٠٠

ئەپۆزیسیۆنی بۆرجوازی زیاد لـە جـــاران توانای بە رێـــگای چارەسەریانەی سەربەخۆ نەمابۆ ، ناچار چووە پاڵ بەرەی ساندینیستاوە ٠ چەند رێکخراوێکی بچوکی بۆرجوازییانە لە رێبازی بۆرجوازی چونە دەرەوەو رێگایەکی سەربەخۆیان گرتە پێش ٠٠ لە مانگی شوباتی ساڵی ١٩٧٩ دا بەرنامەیەکی پێشکەوتوانەو گەلییان دامەزراند ، لـە لایەن بەرەی ئازادیخوازی گەلی ساندینیستاوە پشتگیری لێ ئەکرا ٠

لە ٢٠ی مارسی ١٩٧٩ دا جولانەوەکە روخسارێکی تری گرتـــە خۆ ، هەر سێ باڵەکەی ناو بەرەی ساندینیستا رایان گەیاند کە لە بواری رێکخستنی کۆمەلانی خەلـکدا گەلێك هەنـگاوی تازەو فراوانیان ناوە ، چونـکە هیچ لایەنێکیان بە تەنیـــا توانای راگرتنی باری راپەڕینەکەیان نەبـــو ٠

یەکێتی تازەی ساندینیستا کە لە مانگی حوزیرانی ١٩٧٨ دا لەگـەل « راپەڕینی یەکێتی خەڵك » پرۆژەی یەکێتی تاکتیکی دەستی پێـکرد ، کارێـکی زۆری کردە سەر بەهێز بونی سیاسەتی بەرەی ساندینیستاو لە هەمان کاتا دەستەو کۆمەڵە چەکدارەکانیان بە چەکی مودیرن پڕ چـەك کرد ٠ کەرەسەی داوو دەرمانو هۆی تازەو دەزگای بێ تەلو چـەکی دژی ئاسمانیان پەیدا کرد ٠ ئەو چەکانەی لـــە کـــاتی راپەڕینەکەی تشرینی یەکەمدا پەیدا کرابون بە دەستەوە گیران ٠٠

له رۆژی ١٥ی حوزیران دا دەستەیەك لە پاسەوانەکان کە ژمارەیان ٣٠٠ کەس ئەبون لە نزیکی سنوری کستاریکاوە کەوتنە ناو بۆسـەی شورشگێڕەکانەوە ، زوربەیان کوژران ، زۆریشیان گیران یان بریندار کران .. لە ١٧ی حوزیران دا شاری «لیون» کە دوەمین شاری گەورەی نیکاراگوایەو ٩٠٠ نۆ سەد هەزار دانیشتوانی هـەیە کـەوتە دەست شۆرشگێڕەکان . هێزەکانی پاسەوانی گەلی ناچار بون شارەکەیان بەجێ هێشتو رایان کردە بەرزاییەکانی دەوروبەری شارەوە .

هەر لە هەمان رۆژدا شاری گرانادا کەوتە دەست شۆرشگێڕەکان، رۆژی دوایی شاری «نین دێری» لە دوای شەڕێـکی خوێناوی دەسـتی بە سەردا گیرا ، سەربازەکانی شاری «جینوتپ» کە ٣٠ میـل کەوتبوە خواروی پایتەختەوە بە گورجی رایانکرد .

دەستە چەکدارە کانی ناوچەکانی ژورو لە هەمان رۆژدا توانییان فرۆکە خانەکەی «چیناندگا» داگیر بـکەن .. لـەم سەرکەوتنانەدا ژمارەیەکی زۆر چەکی هەمە جۆرەو تانگ‌و زرێپۆش کـەوتە دەست شۆرشگێڕەکان .. زوربەی رێـگا گەورەکان بە تایبەتی ئەوانەی بـە پایتەختەوە بەسترابون کەوتنـە ژێر کونترۆلی چەکـدارە کـانی ساندینیستاوە .. رادیۆی ساندینۆ کەوتە کار ، رادیۆکە رایگەیاند کـە زوربەی ناوچەکانی ژورو بە دەست چەکدارە شۆرشگێڕەکانەوەیە ..

ماناگوا ، پایتەختی نیکاراگوا ، لە ماوەی سێ هەفتەی رابوردوا(١) بو بە گۆڕەپانی شەڕو پێکدادان‌و کوشتار .. هەواڵنووسەکانی بێـگانە بەو جۆرە رایان گەیاندوە کە تەنیا لەو شارەدا زیاتر لـە پازدە هـەزار کەس خەڵـکی بی دیفاعی شارەکە لەو ماوەیەدا کوژراوون . لە رۆژی

(١) رابردوی ئەو سەردەمەیە ..

٤ی مانگی تەموزدا هێزە شۆرشگێڕەکان بە هۆی پەلاماری وێرانکارانەی هێزەکانی دوژمنو پەلاماری فڕۆکەو بومباردمانی تۆپەکـان ناچـار بون شارەکە بەجێ بهێڵن •

لە رۆژی ۳ی تەموزدا لە دوای گەمـارۆ دانێـکی یەك مانـگی سەربازگەی « ماتا گالپا » خۆی دابە دەستەوە ، هەر لـە هەمـان رۆژدا هێزەکانی دوژمن پەلاماری شاری «ماسایەی دا » بەڵام شکایەوە •• بـە پێی دوا راپۆرتێك کە تاکو کاتی نوسینی ئەم باسە(۱) گەیشتووە ، واتـا [٥ی تەموزی ساڵی ۱۹۷۹]، زیاتر لـە ۲٥ شاری گرنـگی نیکاراگوا کەوتبوە دەست ساندینیستاوە • شەر لـە دەورو بەری شاری «ریڤاس» بەردەوام بو ، شارەکە لە لایەن هێزێـکی هەزار کەسی شۆرشگێڕەکانەوە گەمـارۆ درابو •

ریژیمی سوموزا لە رۆژی ٦ی حوزیران دا دەوڵەتی سەربازی لە سەرتا سەری وڵاتدا راگەیاند •• بۆمبارانی شارەکـان بەشێکی زۆری لـە خانو بەرەکـانی وێران کردبو •• پاسەوانەکان بڕیاریان دابو هیچ کەس بـە دیلی نەگرنو هـەر کەسیان بـەر دەست کـەوت بـکوژن •

لە کۆتایی حوزیرانی ساڵی ۱۹۷۹ دا بەرەی ساندینیستا دەستی بـە کاروباری سیاسی گرنگ کرد ، دەوڵەتێکی کاتی شۆرشگێڕانەی لـە پێنج لایەن دامەزراندو داوای لە دەوڵەتەکانی جیهان کرد کـە بـە رەسمی بیناسن •• دەوڵەتی کاتی لە لایەن دەوڵەتەکانی ڤیتنام ، پیرۆ ، کستاریکا ، پاناماوە بە رەسمی ناسرا •• دوا بە دوای ئەوانیش وڵاتەکانی ئەکوادۆر ، مەکسیك ، بۆلیڤیا ، کۆلومبیا ، فەنزەویلا •• پەیوەندی خۆیان لەگـەل

(۱) تەموزی ساڵی ۱۹۷۹ •

ریژیمی ســوموزا بچراندو دەوڵــەتی کاتی یان بــە رەسمی ناسی •
ڕێکخراوی ئازادیخوازی فەلەستین رایگەیاند کە دەوڵەتی «کاتی» بە تەنیا
دەوڵــەتی راستەقینەو نوێنــەری خەڵکی نیکاراگوا ئەزانێ • تەنانەت
دەوڵەتی راسترەوی بەرازیل پەیوەندی خۆی لەگەل ریژیمی سوموزادا
بچراند ••

دەوڵەتی «کاتی» لــە نوێنەرانی گرنگترین باڵە سیاسیەکانی دژی
ریژیمی سوموزا بو ، رابوردوی هەریەك لە لایەنەکانی دەوڵەت بەرامبەر
بە ریژیمی سوموزا دوژمنایەتی ئاشکرا بوو ••

بۆ دامەزراندنی دەوڵەتی کاتی ئەوە ئاشکرا ئەبێ کە تەقەللایەکی
زۆر دراوە بۆ ئەوەی هەمو لایەنە بەشدارەکانی شۆرش بەشداری لــە
دامەزراندنی دەوڵەتە «کاتی» یەکەدا بکەن • ئەم دەوڵەتە تا ڕادەیەك هەمە
لایەنیانە بوو ، دامەزراندنی دەوڵەتی کاتی کارێــکی زۆری کردە ســەر
بەهێز بونی ئەپۆزیسیۆنو لاواز کردنی ورەی ریژیمی سوموزاو دۆستە
ئەمەریکاییەکانی • ئەمە بە هەنگاوێکی سیاسی ـ دیپلوماسی دانراوە••دوا
بە دوای ئەوە ناسینی دەوڵەتی کاتی لە لایەن هەندێك لە وڵاتانی دەرەوە
ئیمپریالیزمی ئەمەریکای ئاڵۆزاندبو ، تا ئەو رادەیە کە ئەمەریکا ناچــار
بو داوای لەسەر کــار لاچونی سوموزای کرد • دوای ئەوە پارلمــانی
نیکاراگوا بۆ لێکۆڵینەوە لە مەســەلەی لەسەرکار لاچونی ســوموزا کۆ
بونەوە بەڵام ژمارەی بەشــدار بوانی کۆبونەوەکە نەگــەیشتنە رادەی
یاسایی لەبــەر ئەوەی زوربەی ئەندامەکانیان رایان کردبو بۆ دەرەوەی
وڵات •

شەڕ بەردەوام بو ، ئاگرو خوێن لە نیکاراگوادا تێکەڵاو بو ، خەڵکی
ئەو بەڵێنەیان هێنایە دی کــە دابویان بە ساندینیستا ، ئەویش دروشمی
«یان مردن یان گەلی ئازاد» بو •

# چەند ئەنجامێــك

سەرکەوتنی راپەڕینی شۆرشگێڕانەی خەڵکی نیکاراگوا گــەلێك کاری کردە ســەر ئەمەریــکای ناوەندو سەراسەر ئەمەریــکای لاتین •• ئیمپریالیزمی ئەمەریــکای لـــە گرنگترین شوێنێ ســتراتیجیدا خستە مەترسیەوە • ئەلقەیەکی تری زنجیرەی جیهانی ئیمپریالیزم ئەنجامێــکی دوچار بو کــە هیچی لە ئەنجامی شۆرشی «کوبا» کەمتر نەبو • ئیستاش کە هێشتا سەرکەوتنی تەواو بە دەست نەهاتوە ، راپەڕینی شۆرشگێڕانە لـــە هەمو وڵاتەکانی ئەمەریکای لاتین دا کڵپەی سەندوەو پێشڕەوی راپەڕینی شۆرشگێڕانە لە گواتیمالاو هیـــندوراس‌و وڵاتەکـــانی تردا بەرچـــاو ئەکـــەوێت •

جگە لەوەش راپەڕینی شۆرشگێڕانەی نیـــکاراگوا کۆمـــەڵێك تاقیکردنەوەی گرانبەهای بۆ هێزە شۆرشگێڕەکانی جیهان جێ هێشت کـە سودی لێ وەر بـگرن بە تایبەتی ئەهمیەتێکی زۆری بۆ شۆرشگێڕەکانی وڵاتە سەرمایەدارییە گرێدراوەکان هەبو ••

بەرەی ئازادیخوازی گەلی ساندینیستا لــە مـاوەی شازدە ســاڵ راپەڕین دا لــەناو ئاگرو خــوێن دا توانی خۆی وەکـو رابەرێــکی شۆرشگێری خەڵـکی نیکاراگوا دەربخاتو کۆمەڵانی خەڵك پشتگیری لێ بـکەن • یەکێك لە ئەهمیەتە گرنگەکانی ساندینیستا لەگــەل هێـزە چەکدارەکانی ترا ئەوەیە کــە بـە درێژایی راپەڕینەکــە رابەرایەتی راپەڕینەکــەی کردوە • زوربــەی رێــکخراوە شورشگێڕی‌یەکانی ئەمەریکای لاتین، کادیرو رابەرە دەرکەوتوەکانی خۆیان لــە مــاوەی راپەڕینەکەدا لە دەست داوە • لاوازی رابەرایەتی تازە زۆر جـار بۆتە هۆی پارچــە پارچە بونو دوبەرەکایەتی‌و گۆڕینی لــە ناکــاو لــە ناو ئۆرگانەکانی راپەڕینەکەداو لاواز کردنی توانای تیوری‌و رێکخستنی •

«کارلوس فونسە کانا مادور» بونیات نەری بــەرەی ساندینیستا لــە زیندانو شــەڕە جۆر بە جۆرەکانا پارێزراو توانی گەلێك هەڵەی «بەرە» راست بکاتەوە، ناوبراو لەپاش چواردە ساڵ خەباتی راپەڕیو لە ســاڵی ١٩٧٧ دا شەهید کرا •• ئیستاش گەلێك لـە کـادیرە کۆنەکانی بەرەی ساندینیستا لــەناو خــۆو دەرەوەی وڵاتەکانی دراوسێ‌دا درێژە بە راپەڕین ئەدەن •

بەرەی ساندینیستا بە هۆی راستکردنەوەی هەڵە کانیانەوە توانیویانە پایەو پلەیەکی بەهێز لەناو کۆمــەڵانی خەڵـکدا بۆ خۆیان بچەسپێنن‌و بۆرجوازی‌یە لیبرالەکان لە کۆمەڵانی خەڵك دور بخەنەوە • ئەم بەرەیە توانیویتی کرێکارانو جوتیارانو بۆرجوازی‌یە بچوکەکانی شارو « بــە تایبەتی رۆشنبیرەکان » لە خۆیا کۆ بکاتەوە، لــە رێــگای « راپەڕینی

یەکگرتوی خەڵك » و « بەرەی گەلی نیشتمان پەروەران »ەوە رابــەری بەشەکانی تری بۆرجوازیو باڵی رادیکالی بۆرجوازی نیشتمانی بـگرێتە دەست خۆی • لە هەمان کاتا پێویستە ئەوەمان لەیاد بێت کە لایەنـگرانی بەرەی ساندینیستا لەناو چینی کرێکاران دا بــە گشتی بریتی بون لــە کرێـکارە کشتوکاڵی‌یەکانو نیوە پرۆلیتاریای شارەکان •• هێشتا بەشێکی زۆری چینی کرێـکاری سنعەتی نیکاراگوا لەناو حزبی سوشیالیست دان ، واتا ئەوانەی کە چونەتە ناو «راپەرینی یەکگرتووی خەڵك » ەوە •

راپەرینی نیـــکاراگواو شکاندنەوەی ستراتیجی ریفورمیستی بــە دەسەڵاتی سیاسی جارێـکی تر ئەوەیان سەلماند کــە بــە دەست هێنانی دەسەڵاتی سیاسیو پاراستنی تەنیا لە رێـگای تێکشکاندنی تەواوی ئۆرگانە زەبر وەشێنەکانی دەوڵەتو لەناو بردنی لەشکری ئیمپریالیستیانەوە ئەبێت• دەسەڵات گرتنە دەست لــە رێـگای پارلمانو خــۆ نیشاندانی ســەر شەقامەکانەوە لە ئەنجامدا ئەبێتە هۆی تێکشکاندنی راپەرینی خــەڵك • ئەمـــەش تاقیکردنەوەکانی شیلیو ئەرجــەنتینو تەنانــەت رابــەرینی نیکاراگوا بەر لە دامەزراندنی بەرەی ساندینیستا سەلماندوویانە •

راپەرینی چەکدارانەی ئەمەریکای لاتین لەســەر کەلاوە ریفورمیستەکانی رێکخراوە چەپی‌یەکان پێ ی نایە گۆرەپانی چالاکی نواندنەوە ، لەگـــەل ئــەو سەرکـەوتنە سەرەتاییانەدا بــە گورجی دوچــاری نوشوستی تێکشکاندن بو •

چەکــدارە ساندینیستەکــان دوای تێکشکانەکانی یەکەمجــاری چالاکی‌یەکانیان لە ساڵی ١٩٦٣ داو دوای خۆ رێکخستنیان لە ساڵەکــانی

١٩٦٧ـ٦٣ دا توانی یان بە هوی ستراتیجی شەڕی درێژخایەنی خەڵکەوە، ، ڕادەیەك هەڵەکانی خۆیان راست بکەنەوە ، ئەم مەسەلەیە ئەوەی رون کردەوە کە هیچ رێکخراوێکی پارتیزانی بە بێ گەشە کردنی ناکۆکی‌یە کۆمەڵایەتیەکانو بێ کاری سیاسیانەو خۆ رێکخستن ناتوانێت راپەڕینی سەرتاسەری سەرکەوتوانە بە ئەنجام بگەیەنێت •

لە لایەکی تریشەوە پرۆژەی کاری سیاسی‌ور ێکخستنی ساڵەکانی ١٩٦٧ـ٦٣ ئەوەیان رونکردەوە کە کاری سیاسیانەو خۆ رێکخستنی تەنیا لە کاتێکدا سەر ئەگرێو ئەبێتە کارێکی شۆرشگێڕانە کە لە گەل چالاکی چەکداری‌یانەدا هاوشان بن •

هەر رێکخراوێکی شۆرشگێڕانە کە بیەوێ چەرخەکانی حوکمی هەر دەوڵەتێك بگۆڕێت پێویستە شان بە شانی کاری راگەیاندنانەو خۆ رێکخستن هەر لە سەرەتاوە زەمینەش بۆ چالاکی سەربازی‌و دەست وەشاندن ساز بکات •• بۆ ئەمەش پەیوەندی نێوان خەڵکی شارو لادێکان یارمەتی سەرکەوتنی ئەمکارە ئەدات •

راپەڕینی چەکدارانەی لادێکان بە باشی ئەتوانێت زەمینە بۆ کاروباری رێکخستن لە شارەکاندا بڕەخسێنێ •• هەروەها رێکخستنی کۆمەڵانی خەڵکی شار ئەتوانێت شیرازەی چالاکی چەکدارانەی لادێکان فراوانتر بکات •

هەرچۆن بێت تاقیکردنەوە چەکداری‌یەکانی راپەڕینی خەڵکی نیکاراگوا گەلێك تاقیکردنەوەی بە کەڵکی بۆ گەلانی جیهان بەجێ هێشت ••



## کۆتایی :

لە کاتێکدا ئەم کتێبە لە ژێر چاپدا بو ۰۰(۱) راپەڕینی شۆرشگێڕانەی خەڵـکی نیکاراگوا دەسەڵاتی دیکتاتۆری ئیمپریالیستیانەی سـوموزایـان لەناو برد ۰ دوای ٤٦ ساڵ حوکمو دەسەڵاتداریتی ئەو تاقمـە کـۆنـە پەرستانەیان لە رەگ‌و ریشە هەڵکەند ۰۰ خەڵکی شۆرشگێڕی نیکاراگوا کە چەکدارە ساندینیستەکان رابەرایـەتی‌یان ئەـەکردن گـەورەترین دیاردەی مێژوویان لە وڵاتەکانی ئەمەریکای ناوەندا هێنایە دی‌و دەریایەکی ئاگرو خوێنیان پێك هێنا ، دەستێکی قورسیان لە پەیکەری ئیمپریالیزم‌و خاوەن بانقە ئیمپریالیستی‌یەکان‌و بەکرێـگیراوان وەشاند لە ئەمـەریکای لاتین دا ۰ جارێـکی تر راپـەڕینی قارەمانانـەی خـەڵـکی ڤیتنامیان هێنایەوە بەرچاوی جیهان ۰

نیکاراگوا بـە ئـارەزوی گیڤـارا ، قارەمانی خـەڵـکی جیهـان‌و شۆرشگێڕی ئەنتەرناسیونالیست ، لە پێناوی هێنانەدی ڤیتنامیە کـانی ترا بەرگی چالاکی‌یان لەبەر کردو ئەوەیان دەر خست کـە هیچ هێزێك توانای ئەوەی نیە خۆی لەبـەر لێشاوی شۆرشگێڕانەی کۆمـەڵانی خەڵـکدا بـگرێ ۰

(۱) مەبەست لە سـەردەمی کۆتایی راپـەڕینەکەو سـەرەتای سەرکەوتنەکەیە ۰۰

نیکاراگوا جارێکی تر ئەوەی دەرخست کە خەڵک‌و
تەنیا خەڵکە مێژو دروست ئەکەن‌و ئیمپریالیزم‌و
کۆنەپەرستان تەنیا شێری قاقەزینەن •

دوا پەلاماری چەکدارە ساندینیستەکان کە لە سەرەتای مانگی حوزیرانی ساڵی ١٩٧٩ دەستی پێکرد ، لە هەمو بەرەکانی راپەڕینەکەدا ئابوری‌و سیاسی‌و سەربازی‌و دیپلوماسی بە شێوەیەکی یەکسانی بەردەوام بو •• سیاسەتی ئیمپریالیزمی ئەمەریکاو حزبی لیبرالی سوموزای تێك شکاند لە نیکاراگوادا • لە کاتێکدا زوربەی ناوچەکان بە دەست چەکدارەکانی ساندینیستاو لایەنگرەکانیەوە بو ، ئیمپریالیزمی تاوانباری ئەمەریکا ناچار بوو خۆی بکێشێتەوەو پاشەکشە بکات •

واشنتون هەول‌و تەقەللایەکی زۆری دا رێگایەکی چارەسەریانە بدۆزێتەوەو بیخاتە کار بەڵام سودی نەبو •• ئەمکارە بوو بە هۆی ئەوە ئەمەریکا بۆ بەرگرتن لە رادیکالیزە کردنی وڵات پشت بە باڵە راستەکانی ناوخۆی حکومەتی «کاتی» ببەستێت •

لە کاتێکدا شەڕ هێشتا لە بەرەکانی جەنگ دا بە توندی بەردەوام بو ، لەشکری شۆرشگێڕەکان رۆژ لە دوای رۆژ ئەڵقەی گەمارۆ دانی پایتەختی تەنگ تر ئەکردەوە ، گفتوگۆ لە نێوان رێکخراوی وڵاتە ئەمەریکاییەکان‌و واشنتۆن‌و شورای کاتی کە بە دەوڵەتی «کاتی» ناو ئەبرا ، بە کشانەوەی ئەمەریکاو واز هێنانی سوموزا لە حوکم سەری گرت • بەرامبەر بەمە حکومەتی «کاتی» بەڵێنی دا بە شێوەیەکی داد پەروەرانە لەگەل هاوکارەکانی حوکمی سوموزادا رەفتار بکات • وە ئەو کەسانەی دەستیان لە تاوانی گەورەو کوشتنی دەستە جەمعی خەڵکدا

نیه ڕێگایان بدات بڕۆن بۆ دەرەوەی وڵاتو ڕێگای چونە دەرەوەیان لێ نەگرێ • ئەمەریکاش بەڵێنی دا یارمەتی حکومەتی تازە بدات بۆ ئاوەدان کردنەوەی وێرانکاری یەکانی شەڕ • دەوڵەتی تازەش بڕیاری دا یارمەتی بێ مەرجو بەڵێن لە هەر دەوڵەتێك وەر بگرێ بۆ ئاوەدان کردنەوەی وڵاتی نیکاراگوا •

لە دوای ئەمە کۆبونەوەی ئاناسایی پارلمانی نیکاراگوا ، لە کاتێکدا زۆربەی ئەندامەکانیان رایان کردبو بۆ دەرەوە لە سەعات یەکی سەر لە بەیانی رۆژی ١٧ی تەموزدا بەستراو دەست کێشانەوەی سوموزا لە حوکم خوێندرایەوەو لە جیاتی ئەو « فرانسیسکو ئورگویو مالیانو » وەزیری تەندروستی بە سەرکۆمار هەڵبژێردرا • بە بیانوی کۆتایی کوبونەوەکە نوێنەرەکانی پارلمانو ئەندامە بەرزەکانی پاسەوانی گەلیو دەوڵەت بۆ ئەوەی لە وڵات رابکەن رویان کردە فڕۆکەخانە • • هەندێکیشیان کە توانای راکردنیان نەبو پەنایان بردە بەر باڵوێز خانەکانی بێگانە ، رۆژنامە نوسە بێگانەکان وایان راگەیاندوە کە راکردوەکان هەرچی بۆیان بکرایە « تەنانەت لاستیکی ئوتومبیلیان » لە خۆیانەوە بەستبو • سوموزا هەر ئەو شەوە بانقێکی تاڵان کردو رایکرد بۆ ئەمەریکا لەو هاوینە هەوارەی کە ملیۆنێك دۆلاری تێ چو بو لە کەناری «میامی» لێی دانیشت •

کاتێك دەست کێشانەوەی سوموزا لە وڵات راگەیەندرا ، خەڵك بە تەواوی رژانە سەر شەقامەکان دەستیان کرد بە شایی‌و سەما کردن •• لە شارەکانا دەنگی دەستڕێژی چەکدارە ساندینیستەکانو دەنگی ئۆتۆمبیلەکان تێکەڵ بوبون ، ژنو پیاوو گەورەو بچوك بەلامـاری ڕوخساری ڕیژیمی کۆنیان ئەدا • گەورە ترین هاوارو هەڵپەڕکێی

خەڵك لە کاتێکدا بو کـــە پەیکەرەکەی باوکی سوموزایان لــە بەردەم ستادیومی وەزرشی ماناگوادا روخاند •

لە هەمان کاتا شورای کاتی رایگەیاند کە لە ماوەی بیستو چـوار سەعاتی داهاتودا دێتە ماناگواوە بۆ ئەوەی حوکمی وڵات بگرێتە دەست• لەو کـــاتەدا جێگری سوموزا پێچەوانەی ئەوەی چـــاوەڕوانی ئەکرا رایگەیاند کــە فەرمانی داوە بـــە پاسەوانە گەلی‌یەکان تا دوا کاتی ژیان خۆیان رابگرنو شەڕی شۆرشگێڕە کان بکەن • «ئورکویو» کــە بڕیار وابو فەرمانی ئاگر بەست دەر بکات لە دووانێکی رادیۆیی‌دا وەکو شێت ئەوەی راگەیاند کە تا کۆتایی ماوەی سەرکۆماری یەکـــەی سەنـــگەری خۆی چۆڵ ناکات •• داوای لە چەکدارەکانی ساندینیستا کرد کــە بــە گورجی چەکە کانیان دابنێنو خۆیان بدەن بـــە دەستەوە ، رایـــگەیاند ئەگـــەر شورای کاتی بێنە ناو شاری ماناگواوە ئەوا فەرمانی بە پاسەوانە گەلی‌یەکان داوە دەمودەس بیانگرنو بیانکوژن •

بەرامبـــەر بـــەم هەڵوێستە چاوەڕوان نەکراوەی ئەرکویو ، وەزارەتی دەرەوەی ئەمەریکا کــە هەستی بەمەترسی ئەوە ئەکرد باڵی رادیکال دەسەڵاتی سیاسی بـــگرنە دەست ، جـــار لـــە دوای جـار بەر پەرچی ئەدایەوە •• وەزارەتی دەرەوە لـــە گفتـو گۆیەکی تەلەفۆنی دا لەگـــەل سوموزا پێی راگەیاند کـــە پێویستە ئاگری شەڕ بە گورجی رابگیرێو ئەگـــــەر بێتو وەهـــا نەکرێ ئەوا ئەو « واتە ، سوموزا » لــە ئەمەریکا ئەکرێتە دەرەوە •

بەڵام لــە واقیــعدا نیازی بــە راگرتنی ئاگری شــەڕ نەبو ، سەرکردەکانی پاسەوانە گەلی‌یەکان زوربەیان لە نیکاراگوا رایان کرد بو یان خۆیان دابو بــە دەستەوە ‪..‬ لەشکری دوازدە هــەزار کــەسی پاسەوانەکان دەستە بەدەستەو ، کۆمەڵ بە کۆمەڵ لە هۆردوگاکان رایان ئەکردو خۆیان ئەدا بــە دەست شۆرشگێڕەکانەوە ‪.‬ ئورکویو سوڵتانی یەك رۆژەی نیکاراگوا بــەر لەوەی مــاوەی دەسەڵاتداریتی‌یەکەی ببێت بە دو رۆژ ناچار بو پەنا بەرێتە بەر گواتیمالاو خۆی رزگار بکات ‪.‬

لە هەمان کاتا دەستە بە دەستە لەشکری چەکدارە شۆرشگێڕەکــان هاتنە ناو شاری ماناگواوەو پاشماوەکانی پاسەوانە گەلی‌یەکانیان لەناو بردو بنەبڕ یان کردن ، رۆژی دوایی شورای پێنج کــەسی دەوڵەتی کــاتی ئەوانیش هاتنە ناو پایتەختەوەو یەکەمین پەیامی خۆیان لە بەردەم کوشکی گەلی‌و لە بەردەم هەزاران کەس دا خوێندەوە ‪.‬

بەمجۆرە ریژیمی ٤٦ ساڵەی سوموزا لەناو چو ، راپەڕینی خەڵکی نیکاراگوا گۆڕانێــکی گەورەی بــە ســەر باری سیاسی‌و ئابوری‌و کۆمەڵایەتی وڵاتی نیکاراگوادا هێنا ‪.‬

سەرکەوتنی خەڵــکی نیکاراگوا لــەم قۆناغەدا بــە مانای کۆتایی راپەڕینەکەو گەیشتنی بە ئەنجامی شۆرشەکە نیە ، بە قسەی یەکێك لــە سەرکردەکانی چەکدارە ساندینیستەکان وتویەتی :

« تازە سەرەتای راپەڕین دەست پێ ئەکات ‪..‬ لــە ناو بردنی ریژیمی دیکتاتوری سوموزا کــە تەنیا لــە قۆناغی دوا پەلاماردا زیاتر لــە چــل هەزار کوژراوو شەش سەد هەزار بێ خانەو لانە کەوتن «چوار یەکێکی

دانیشتوانی وڵاتەکە » ئەمە بە سەرکەوتنێکی گـــەورە دائەنرێ ، بەڵام خەڵـکی نیکاراگوا تا ئەو کاتەی ئەگاتە سەربەخۆیی‌و ، ئازادی تەواو بـــە دەست دێنی‌و دادی کۆمەڵایەتی لە وڵاتدا ئەچەسپێنێ .. رێگا یەکی درێژی لـــە بەرە » .

شورای کاتی پێنج کەسی « کە لە مەوبەر باسی ماهیـەتی چینایەتیمان کردن » دوای ئەوەی دەسەڵاتیان گرتە دەست ، کابینەیەکی پازدە کـەسی یان پێک هێنا ، کە بە زۆری لە باڵە میانە رەوی‌یە کانی راپەڕینەکە بون . لەو کابینەیەدا بە زۆری باڵـە ئەپۆزیسیۆنەکانی بۆرجوازی راسترەوی بەرەی ساندینیستا بەشدار بون .. ئەم دروستبوونە شۆرشگێڕی‌یە بـە هیچ جۆر دەسەڵاتی هێزە رادیکالەکان دەر ناخات .

ئەندامی رادیکالی کابینە بریتی بو لە توماس بورگ مارتنیز « کـــە یەکێك بو لە رابەرەکانی ساندینیستا » بو بە وەزیری ناو خۆو لەگـــەل وارنیشۆ کاردینال مارتنیز « قەشەی رادیکال » وەزیری فەرهەنگ بو .

میـــگوئیل ئاسکوتو وەزیری دەرەوە بـو ، ناوبراو قەشـــەیەکی شۆرشگێڕ بو ، رقی لە هەمو جۆرە پەیوەندی‌یەکی سیاسی ئەبۆوە لەگـەل ئەمەریـکا دا . لـــەو باوەڕەدا بو کـــە پێویستە نیکاراگوا سیاسەتێکی سەربەخۆی هەبێت . هەروەها دوای ئەوەی ئەرکی وەزارەتی دەرەوەی پێ سپێردرا رایگەیاند کـە هەمو رێکەوتننامـەو بەڵێننامەکانی لەگـەل ئەمەریکادا هەڵ ئەوەشێنێتەوە ، بە زوترین کـــات نیکاراگوا ئەچێتە ناو ریزی وڵاتە بێ لایەنەکانەوە .

شورای پێنج کەسی‌و کابینەی سرگیورا میرز مرکادو «٣٦٠» ساڵەیی

که بو بە رابەری شوراکە ، کوڕی قاوە فرۆشێکی ژیان مام ناوەندی بو .
لە کاتێکدا لە شاری «لیۆن» لە فرانکۆی نیکاراگوا لە بەشی یاسا ئەیخوێند
چوە ناو ریزی ناحەزانی سوموزاوەو پەیوەندی بە راپەڕینی خەڵکەکانی
نیکاراگواوە کرد ، لە کــاتی سەرکەوتنی شەپۆلی تازەی راپەڕینەکەدا
دەستەی دوازدە کەسی دامەزراند .. ئەو دەستەیە نوێنەری باڵی رادیکالی
بۆرجوازی نیشتمانی نیکاراگوا بو ، پەیوەندی‌یەکی بە تینی لەگەل بەرەی
ساندینیستادا هەبو ، بەشداری بەرەی گــەلی نیشتمان پەروەرانی کردو
رۆلێکی گەورەی لە بواری سیاسی نیکاراگوادا گێڕا .

رامیرز لەگەل ئەوەدا سیاسی بو ، داستـــان نوس‌و شاعیریش بو ،
کە لەگــەل خاسیەتە تایبەتیەکانی کۆمـــەڵو سروشتی کۆمەڵایەتیانەی
خەڵـکدا بگونجێت .

شورای کــاتی‌و کابینەی پازدە کەسی لە ماوەیەکی کەمدا چـــەند
کارێـکی گرنـگی بە ئەنجـام گـەیاند وەکو هەڵوەشاندنەوەی پاسەوانی
گەلی ، کاربەدەستانی تازەی نیکاراگوا بـــە باشی لەوە گەیشتبون کـــە
پاسەوانی گەلی یەکێکە لە ئۆرگانە بنچینەییەکانی ئیمپریالیزم‌و ، ئامێری
دەستی دزو تالآنکەرەکانی دەرەوە بوە لە نیکاراگوادا .

تاقیـکردنەوەی ولاتەکانی ئەمەریـکای لاتین‌و ولآتانی تر ئەوەیان
دەرخستوە کـە بە بێ لەناو بردنی لەشکری دژی خەڵـکی‌و ئیستیعماری
نوێ هەر قسەیەك دەربارەی سەربەخۆیی‌و ئازادی‌و پاراستنی دەسەلآتی
نیشتمانی یەوە بکرێ بە هیچ ئەچێت. تاقیکردنەوە دڵ تەزێنەکەی شیلی‌و
ئەرجەنتین بە باشی دوارۆژی رابەرە نیشتمانیەکان دیاری ئەکات کــە
نەیانەوێ یان بۆیان نەکرێ دەزگـــا سەربازی‌و ئیداری‌یەکانی ریژیمی
کۆن لـــەناو بەرن . لەو ولآتانە دەزگـــا سەرکوتکەرە بنچینەییەکانی

ئیمپریالیزم وەکـــو خـــۆی مایەوە ، لەبەر ئەمە لەشکری بەرواڵـەت «نیشتمانی» لە ماوەیەکی کەمدا توانی بە هـــۆی نەمانی شەڕو راپەڕینی شۆرشگێڕانەی خەڵـکەوە ، بە هۆی هەڵو مەرجی دژ بە شۆرش‌و ، لە رێـگای کودتایەکی سەربازی‌یەوە •• جارێـکی تر دەسەڵاتو حاکمیەتی ئیمپریالیزمی لە وڵاتدا هێنایەوە کایە •• ئینجا لەبەر ئەوەیە لەناو بردنی پاسەوانە گەلی‌یەکان بە سەرکەوتنێکی گـــەورەی گـــەلی نیـکاراگوا دائەنرێت •

ئیستاش لەشکری چەکدارە ساندینیستەکان کـــە لـــە کرێـکارو جوتیاران پێک هاتووە ، بـــە رەسمی جێگەداری لەشکری ئیستیعماری تازەی نیکاراگوایە •• لەشکری پارتیزانی پێنج هەزار کەسی ساندینیستا کـــە ناوی «میلیشای خەڵک»ی لێ نراوە بە سەرکردەیی « تومـــاس بورگێ » ـ کە یەکێکە لە رابەرەکانی ساندینیستا ـ لـــە ئیستا بـــە دواوە لە جێگای لەشکری نیکاراگوا حوکم ئەکات •

جگە لە لەناو بردنی پاسەوانی گەلی ، گەلێک کومپانیای گـــەورەو بانقی تایبەتی لە هەفتەی یەکەمی شۆرش‌دا خۆماڵی کرانو بون بە مڵکی دەوڵەت •• پاسای بنچینەیی سوموزا لـــە ناو چـــو و هەڵوەشایەوە ، پارلمانو دیوانی عـــالی وڵات نەمـــان ، هەمو سامانی ئـــەو عونسورە دەوڵەمەندانەی سەر بە ریژیمی سوموزا بون دەستیان بەسـەردا گیرا ، لەگەل ئەوەدا سیاسەتی ریژیمی تازەی نیکاراگوا لـــەو زەمینەیەدا ئەرکەکانی خۆی بە تەواوی بەجێ نەهێنا • پێویستە ئەمەش بە هـــۆی باری چۆنێتی ئابوری وڵاتو ئەو باڵەپەستۆیە بزانین کـــە لـــە لایەن راستڕەوەکانەوە کەوتبوە سەر شورای کاتی‌و کابینەکە • کە ئەمانە نەیان ئەویست بە شێوەیەکی رادیکالی‌یانە هەمو سامانو سەرمایەی وڵات میلی

بکرێ .. ئەلفونسو کالاجاس ، ئەندامی شورای پێنج کەسی ، خۆی یەکێکە لە سەرمایەدارە خاوەن سنعەتی یەکانی نیکاراگوا ، کە پەیوەندی یەکی بە تینی لەگەل دو دەستە دارایی یە گەورەکەی نیکاراگوادا هەیە . لەبەر ئەوە داوای پاراستنی قازانجی ئەو سەرمایەدارە گەورانەی ئەکرد کە پەیوەندی یان بە دەستە ئابوری یەکەی سوموزاوە نەبو .

جگە لەوەش رابەرە تازەکانی نیکاراگوا ، دادی کۆمەلایەتی ، دابین کردنی خزمەتگوزاری کۆمەلایەتی ، یەکسانی بۆ هەمو خەلك ، ئازادی تاکە کەسیو کۆمەلایەتی ، دەست پێکرد .

لە زەمینەی سیاسەتی دەرەوەشدا رابەرە تازەکانی نیکاراگوا ئەوەیان راگەیاند ئەیانەوێ لەگەل هەمو ئەو ولاتانەدا دۆستایەتی بکەن کە رێزی سەربەخۆییو سەربەستی یەکەیان ئەگرن .. دوا بە دوای دامەزراندنی دەولەتی تازەدا بە هەفتەیەك ، دو کەس لە ئەندامانی شورای پێنج کەسی رۆیشتن بۆ «هاڤانا» پایتەختی کوبا ، تاکو لە جەژنی سالانەی یادی پەلامار بردنە سەر هوردوگای «مونکا» دا بەشداری بکەن کە لە رۆژی ٢٥ی تەموزی سالی ١٩٥٦ دا بو ، فیدل کاسترو بەلێنی بە نوێنەرەکانی شورای تازەدا کە کوبا ئامادەیە ئەوەندەی نیکاراگوا پەوێت ماموستاو دکتور بنێرێت بۆ ولاتەکەیان . «کاسترۆ» وتی :

« نابێت نیکاراگوا بیێتە کوبایەکی تر ، بەلکو پێویستە ببێتە نیکاراگوایەکی تازە » .

دەولەتی نیکاراگواش چەند جارێك پشتگیری خۆی بۆ دەولەتو

کەلی کوبا دەربڕیوەو پشتگیری لە ڕێبازی سیاسی‌و ئەخلاقی کوبا کردوە ..

سیاسەتی رابەرە تازەکانی نیکاراگوا بەرامبەر بە ئەمەریکا ماهیەتێکی دو روالەتانەی هەیە ، ئەمەریکاش هەر بە دو دلی‌یەوە مامەلە لەگەل دەولەتی تازەدا ئەکات .. واشنتون دوای جێگیر بونی شورای شۆرش بالۆێزی خۆی بە فرۆکەیەکی تایبەتی نارد بۆ نیکاراگواو ئامادەیی خۆی دەربڕی کە ئامادەیە لە ئاوەدانکردنەوەی ولاتی نیکاراگوادا یارمەتیان بدات . ئامانجی دەولەتی ئەمەریکا ئەوە بو بە هۆی یارمەتیدانی ریژیمی تازەوە بالە راستەکەی ناو شورای شورش بەهێز بکات‌و سنور بۆ زەمینەی «بەرەو کوبا رۆیشتن» دابنێت .

بەرەی ساندینستا بەرامبەر بەم کارە ئەویش داوای ئەوەی ئەکرد لە ئەمەریکا دورە پەرێز بن‌و هیچ جۆرە یارمەتیەکی بەو جۆرەیان لێ وەر نەگرن .. ئەم نیازە دو لایەنیە لە روالەتی دەولەتدا بەرامبەر بە ئەمەریکا دەر کەوت .

بێگومان قازانجی بالە راستەکەی ناو شورای پێنج کەسی‌و سیاسەتی هاریکاری کردن لەگەل ئەمەریکا دا نەك هەر تاکتیك بو بەلکو لە بنەڕەتەوە روخسارێکی ستراتیجیانەی هەبو . دەولەتی تازە لە لایەکەوە داوای چەکی لە ئەمەریکا ئەکردو لە لایەکی تریشەوە ئەوەی بلاو کردبۆوە کە هەر جۆرە چەکێك‌و لە هەر لایەنێکی دەرەوەو هەر سەرچاوەیەکەوە وەر بگیرێ بۆ « بەرگری کردنە لە ولات‌و بۆ لەناو بردنی پیلانە ئیمپریالیستی‌یە کانە » .

بەرەی ساندینستا هەر لە سەرەتای شەڕەوە ، زۆر هۆشیارانە سیاسەتی خۆ رێکخستنی لەگەل بەشێك

له بۆرجوازی‌یه گرێدراوه‌کانا گرته بەر بۆ ئەوەی
بەرگیری له دەستێوەردانی سەربازی راسته‌و خۆی
ئەمەریکا بکات • ئەم سیاسەتەش بە نیسبەت « بەرە »
وە کاریکی سەرکەوتوانەو ستراتیجی بو •

دەزگای حاکمیەتی ئیستای نیکاراگوا له هەل‌و مەرجی ئیستادا
ماهیەتێکی هەمە بەرەیی « ئیئتیلافی » بە هەمو مانایەك « دیموکراتیانە » یە،
چونکە زوربەی رێکخراوو دەستەو تاقمە سیاسی‌یەکانی دژی ریژیمی
سوموزا « بەرەی فراوانی ئەپۆزیسیۆن ، بەرەی گەلی نیشتمان
پەروەران ، راپەرینی یەکگرتووی خەڵك‌و بەرەی ساندینیستا » ،
نوێنەرانی هەندێك له بۆرجوازی‌یە گرێدراوەکان ، بۆرجوازی نیشتمانی،
بۆرجوازی بچوك ، ئەمانەو چەندان لایەنی تر لە دەزگاو ئۆرگانی
دەوڵەتدا بەشدار بون • ئاشکرایە ئەو تێکەڵ بوونە ناجۆرە هەرگیز
توانای ئەوەی نابێ ماوەیەکی دورو درێژ بمێنێتەوە ، مشت‌و مڕ لە سەر
دەسەڵات گرتنە دەست‌و خۆ فەرز کردنی لایەنە بەهێزەکان دەست پێ
ئەکات • چەند رۆژێك تازە بەسەر شۆرش‌دا تێپەڕیبو شەڕو لێکدانێکی
گەورە لە نێوان لایەنگرەکانی شەڕی درێژ خایەنی خەڵکی‌و لایەنگرەکانی
« ترسریستاس » لە شاری « لیون » دا رویدا ، کە باڵە پرۆلیتاریاییەکەی
ناو رابەرانی شار شەڕەکەیان دامرکاندەوە • لە راستیدا دوای لەناو
چونی ریژیمی سوموزا رواڵەتی بەشە یەکگرتوەکانی ناو دەزگاکانی
دەوڵەت‌و شورای شۆرش بە هیچ جۆر رون نیە • هەندێك لە رابەرە
تازەکان ئەڵێن کە « ئامانجی ئیستامان فراوانکردنی باری ئابوری‌و
کۆمەڵایەتی وڵاتە » •

بێگومان سەرلەنوێ دامەزراندنەوەی ئابوری کە شەڕ دوای خستبو

کارێکی گرنگ‌و پێویسته • زوربه‌ی شاره‌کانی نیکاراکوا له ماوه‌ی شه‌ڕی ناوخۆیدا به ته‌واوی وێران بوبون • شاری « ستلی » له لاژوروی وڵات ته‌نیا که‌لاوه‌کانی مابونه‌وه ، له « ماتا گالپا » هیچ خانوو به‌ره‌یه‌ك نه‌مابۆوه • به‌لای که‌مه‌وه سێ چواریه‌کی هه‌مو ده‌زگا سنعه‌تی‌یه‌کانی وڵات وێران بوبون ، هه‌روه‌ها باری کشتوکاڵیش وه‌کو خۆی نه‌مابۆووه • کشتوکاڵی لۆکه که گه‌وره‌ترین به‌روبومی کشتوکاڵی وڵات بو راوه‌ستابو ، وه‌کو ئه‌ڵێن زیاتر له ۳۵۰ ملیۆن دۆلار زیان له خه‌ڵکی نیکاراگوا که‌وتبو • زیاتر له چوار یه‌کێکی خه‌ڵکی وڵات ئاواره‌ی ئه‌ملاو ئه‌ولا بوبون‌و بیکاری بوبو به گه‌وره ترین رواڵه‌تی کۆمه‌ڵایه‌تی •

له‌گه‌ل ئه‌وه‌دا ئاوه‌دانکردنه‌وه‌ی وڵات‌و سه‌ر له نوێ دامه‌زراندنه‌وه‌ی باری ئابوری ناتوانێت یه‌کێتی ناو ده‌زگاکانی ده‌وڵه‌ت دابین بکات • ته‌نانه‌ت له کاتی قایل بون به‌و کاره‌ش دا جۆری جێ به‌جێ کردنی دیسان به پێی ئاره‌زوی جۆر به جۆری نوێنه‌ره‌کانی ناو ده‌زگاکانی ده‌وڵه‌ته‌وه هه‌ر دڵنیگه‌رانی تیادا ئه‌بێ • بۆ نمونه :

> له باره‌ی کشتوکاڵه‌وه باڵی رادیکالی داوای سیاسه‌تی دابه‌شکردنی زه‌وی‌و زاری ئه‌کرد ، له هه‌مان کاتا بۆرجوازی‌یه‌کان ئه‌وه‌نده خۆشیان به‌م سیاسه‌ته نه ئه‌هات •

له زه‌مینه‌ی سه‌ر له نوێ دامه‌زراندنه‌وه‌ی سنعه‌تی وڵاتدا باڵه راسته‌که‌ی ده‌وڵه‌ت پێشنیاری ئه‌وه‌ی ئه‌کرد که به‌رنامه‌ی به‌کار خستنی سه‌رمایه‌ی ده‌ره‌وه له وڵاتدا بۆ گه‌شه کردنی پیشه‌سازی ناوخۆ به‌کار بێنن • له کاتێکدا ئه‌م سیاسه‌ته له لایه‌ن باڵی رادیکالی به‌ره‌ی ساندینیستاوه •

ڕەت ئەکرایەوە • لەبەر ئەمە ناکۆکی ناو دەرونی باڵە جۆر بە جۆرەکانی دەزگاکانی حوکم بە چەندان شێوەی جیا جیا پەیدا بو •

ئەو مەسەلەیە کە ئەمڕۆ باڵی مام ناوەندی یان بڵێین « میانە ڕەوی » بۆرجوازی بەسەر دەزگاکانی دەوڵەتدا حوکم ئەکات بە تەنیایی ئەوەندە ماهیەتی شۆرشگێڕانەی شۆرشی نیکاراکوا دەر ناخات •• بەرامبەر بەم کارە پێویستە واقیعێکی تر بهێنینە بەرچاو ئەویش میلیشیای خەڵکە کە لە کرێکارو جوتیارو ڕۆشنبیرە شۆرشگێڕەکان پێك هاتوە ••

بەمجۆرە لە هەلو مەرجی ئێستادا بەو هەمو ڕواڵەتە جیا جیا یانەوە کە لە زەمینەی دەسەڵاتی هێزە جۆر بە جۆرەکانا هەیە زۆر ستەمە بتوانرێ ڕەوتی کۆمەڵی نیکاراگوا دیاری بکرێ •• هوشیاری باڵە چەپەکان لەم ڕوەوە بۆ خۆ ڕێکخستن‌و خۆ گورج کردنەوە ، بۆ درێژە دان بە شۆرش دوا ڕۆژی شۆرش دەست نیشان ئەکات •• ئەوەی ڕاست بێت ئەوەیە شورشی نیکاراگوا ڕوخساری ئەمەریکای ناوەندو سیاسەتی وڵاتەکەی بە تەواوی ئاوەژۆ کردەوە ، کارێکی گەورەشی کردە سەر ڕوداوە سیاسیەکانی ناوچەکە •

جگە لەوەش تاقیکردنەوەکانی شورشی نیکاراگوا گەلێك دەرسی گەورەی فێری شۆرشگێڕەکانی هەمو ئەو وڵاتانەی داگیر کراون کرد • دەرس وەرگرتن لەو تاقیکردنەوانە کارێکە لە ئەستۆی هێزە شۆرشگێڕەکانی ئەمەریکای لاتین دایە •



# سەرچاوەکانی ئەم کتێبە

بۆ دانانی ئەم کتێبە گەلێك سەرچاوە دراوە بە یەکدا کە ناگونجێ هەموویان باس بکرێن .. ئەوا لەم لیستەیەدا ناوی هەندێك لەو سەرچاوانەی ئەم باسەیان لێ وەرگیراون ئەخەینە بەر چاوی خوێنەرە بەرێزەکان :


1- Los Angeles Times, Nov. 5. 1978 - etc.

2- New York Tims, July 30, 1978, Oct. 20, 1978 August 6. 1978 etc.

3- Washing ton Post, Nov, 19, 1978, Nov. 3' 1978. sep' 15 and 24. 1978. etc.

4- Guar dion ( U. S. ) Several issues,

5- Nicaragua : On the General political - Mili tary Pla torm of the sandinista frontfor National liberation, May 4. 1977.

6- NACLA. Crisies Nicaragua, Dec - Dec. 1978 .

7- NACLA Nicaragua. Fed, 1976.

8- NACLA May. 1979.

9- Latin America Economic Report. Oct. 1978.

10- Richard Millett, Guardians of the Dynasty. 1978,

# ناوەڕۆك

| سەرباسەکان | لاپەڕە |
| --- | --- |

ساعدت الامانة العامة للثقافة والشباب لمنطقة الحكم الذاتي على طبعها

# نهضة نيكاراگوا

ترجمة من الفارسية
برهان قانع

چاپخانەی ( الحوادث )
نرخی ( ٧٥٠ ) فلسە